پرۆژەی تیشک (٥٧)

# تاک و حکومەت لە شەریعەتی ئیسلامدا

نووسینی
دکتور عبدالکريم زيدان
وەرگێڕانی لە فارسییەوە
هێمن ڕێنوار

٢٠٠٩

ناوی کتێب:  تاک و حکومەت لە شەریعەتی ئیسلامیدا

نووسینی:  دکتۆر عبدالكريم زيدان

وەرگێڕانی:  هێمن ڕێنوار

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٢٥) ساڵی (٢٠٠٣)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ:  ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٥٧)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

**بسم الله الرحمن الرحيم**

"سەرپەرشتی کردنی کاروبارەکانی خەڵکی لە گرنگترین ئەرکە ئاینییەکانە، کە ئەگەر بە هۆی ئەوەوە نەبێت دینداری بە دامەزراوی نامێنێتەوە، هەر لەم روانگەیەشەوەیە کە خوای گەورە فەرمان بە چاکە و قەدەغەی خراپە و یارمەتی ستەم لێ کراوو چەندەها بابەتی تری وەکو جیهاد و دادپەوەری و بەجێ هێنانی سنوورەکان و .. هتد، کە بێ بوونی دەسەڵات و حکومەت پیادە ناکرێن، واجبی کردوون".

"ئازادی رادەربڕین یەکێکە لە مافەکانی تاك کە لە حکومەتی ئیسلامیدا لە کۆتایی گرنگی و بایەخدا جێگەی گرتووە، بچووککردنەوەی ئەم مافە لە لایەن حکومەتەوە ناڕەوایە، بۆ تاکیش بە هەمان شێوە رەوا نییە کە چاوپۆشی لێبکات".

## پێشەكی وەرگێڕ

لە كلتووری ئیسلامییدا ڕێزو جێگەی سەركردایەتی بۆ تاك لەبەرچاو گیراوە، وەك خوای گەورە دەفەرمویێت:﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾﴾ (الإسراء:٧٠) واتە: (سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووەو بەسەر وشكانیو دەریادا هەڵمان گرتوونو لە رزقو ڕۆزی پوخت و چاكی جۆراوجۆر بەهرەوەرمان كردوون، بەراستی ئێمە ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدی هێنراوانەی دروستمان كردوون).

لەبەدی هێنانی مرۆڤدا، هەر لە سەرەتای دروستكردنییەوە فەرمان بە ڕێزگرتنی پلەوپایەی دراوە، لێرەدا كە خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾﴾ (ص: ٧١ – ٧٢) واتە: كاتێك پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: من مرۆڤێك لە قوڕ دروست دەكەم، جار هەر كاتێك تەواوم كردو لەو (ڕوح)ەی كە من خاوەنیم كردم بە بەریدا تێكڕا سوجدەی بۆ بەرن.

لەبەرئەوە شەیتان (ابلیس) مرۆڤی بە نارێك و كەمو كورت ژماردو موناقەشەی لەگەڵ خوادا كرد، نەفرەتی لێكراو لە ڕەحمی خوا كرایە دەرەوە.

لە شەریعەتی ئیسلامدا تاك لە مەیدانی كۆمەڵدا لە مرۆڤەكانی تردا ون نابێت و ڕێزو گەورەیی لەناو ناچێت، بەڵكو لە پێودانگی شەریعەتدا ڕێزی تاكێك بەرامبەر بە سەرجەمی كۆمەڵگایە، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾﴾(المائدة: ٣٢). واتە: ئەوەی كەسێك بە ناڕەوا بكوژێت، بێئەوەی كەسێكی كوشتبێت، یان تاوانی گەورەی ئەنجامدابێت لەسەر زەویدا، وەك ئەوە وایە سەرجەمی مرۆڤی كوشتبێت،

وە هەرکەس کەسێك لەمەرگ رزگار بکات، هەروەك ئەوە وایە سەرجەمی مرۆڤی لەمەرگ رزگار کردبێت.

ناتوانرێت خەیاڵ بکرێت کە کەسێك لە خوا بترسێتو لە بەرامبەر ئەو هەموو هەڕەشانەی خوای گەورەدا مۆڵەت بە خۆی بدات کە مافو ئازادی تاکەکان پێشێل بکات لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ (**النساء**: ٩٣) واتە: هەرکەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیمانداریك بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی تووڕە بووەو نەفرینی لێکردووەو سزایەکی گەورەو بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە.

ئیسلام هەموو جۆرە تێپەڕینو ستەمێکی قەدەغە کردووەو لە پێناو پیادەکردنی دادپەروەری لە ژیانی مرۆڤداو راستکردنەوەی نابەرامبەرییەکانی، پێشکەوتووترین بەرنامەی مافەکانی لەگەڵ زانیاری کرداریو رۆحی بۆ داناوە، هەروەها سەرنجی بۆ رەهەندە (بُعد) جۆراوجۆرەکانی ژیانی هەر لە پێش لە دایك بوونیەوە تا دوای مردنیشی راکێشاوە، لەبەرئەوە عەقڵی تەواو ناتوانێت پەسەندی کات کە دۆزێك بۆ تەواوی گۆشەو قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ بەرنامەی هەبێتو مەیدانی هاتوچۆی ئەو هەموو گۆڕەپانە مادیو مەعنەوییانەی ژیانی تاك و کۆمەڵگە بێت، بەڵام خودی ئەو سنووردارو گەمارۆ بدرێ تەنها بە مزگەوتەوە، لەلایەکی ترەوە ستەمکارو سەرکەشەکان رێنماو رابەری ئوممەتی ئیسلام بن.

چۆن رووئەدات کە تاك دەستی بە بەختەوەری بگات لە کاتێکدا دەسەڵاتداران لە بەرامبەر بیروباوەڕەکەیدا بوەستنو سنتوورەکانی حەڵاڵو حەرامی خوای گەورە لەبەرچاو نەگرن؟

بۆیە ئیمان جگە لە نەفی کردنێکی رەهای دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی سەرکەشان و ستەمکاران پیادەنابێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (**البقرة**: ٢٥٦) واتە: ئەوەی بێ باوەڕ بێت بە تاغوت: "بریتییە لە هەموو رێگەو هێزو دەسەڵاتێکی لادەرو ستەمکار" و باوەڕی

دامەزراو بەخوا بێنێت، ئەوا بێگومان دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری رزگارییەوە کە هیچ پسانو هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە، خوای گەورە بیسەرو زانایە.

پێویستە سەرپێچی کردنی تاغوت، سەرپێچی لە فەرمانەکانیو هەستان لە بەرامبەر حکومەتەکەیدا، ئەگەر موسڵمانان خاوەنی هێزو فەرمانڕەوایی نەبن کە لە بەرامبەر ئەو ستەمکارانەدا بوەستن، چۆن توانای دژایەتیی کردنیان دەبێت؟

ئەگەر لە بەرامبەر فێرعەونە خوێنڕێژەکاندا خۆپیشاندانو سکاڵا بەرز بکەنەوە ئایا لە لایەن ئەوانەوە ئەلاوێنرێنەوە، یاخود لەگەڵ خاووخێزانیاندا بەرەو قەسابخانەکان بەڕێ ئەکرێن؟

لە کاتێکیشدا پیادەکردنی ئیمان لە چاخو زەمانی فەرمانڕەوایی پێغەمبەردا ﷺ بریتییە لە بەرزترین جێگای فەرمانڕەواییو حکومەتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا ﴾ (**النساء: ٦٥**). واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێ دەدەن) بڕوادار نین هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە روو دەدات لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن دوای ئەوەش نابێت لەدڵو دەروونیاندا هیچ نارەزاییەوك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە دادوەریت لەسەر کردووەو دەبێت بە تەواوی تەسلیمو رازی بن.

کەسایەتی موسڵمان لە کاتێکدا کە بەرنامەی ئیسلام بۆ ئەم سەردەمە بەگونجاو نەزانێت، یاخود جەخت لەسەر بەرنامەیەکی تر بکاتەوە لەبەرامبەر یاسای خوادا، یا بە هەندێکی رازی بێتو بەهەندێکی نارازی بێت، یاخود بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی بە کەموکورتی بزانێت، یان هەریەك لە بەشەکانی ئەم کۆمەڵە پێکەوەییە لە روی فەرمانڕەواییو رامیاریو ئابوریو کۆمەڵایەتیو ... هتد لە ئیسلام جیا بکاتەوە بە رای کۆمەڵێ زانایانی ئیسلام لە دین دەردەچێتو ئەگەر بمرێت بە دەستووری کافرەکان و لەسەر ئاینی ئەوان حەشر دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴾ (**النساء: ٦٠**) واتە: ئایا نەتان ڕەوانییە ئەوانەی کە لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بە ڕاستی

باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانە کراوە؟، کەچی دەیانەوێت ڕوو بکەنە زۆردارو خوانەناسان دادوەرییان لە نێواندا بکەن، لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە تاغوت (**طاغوت**) نەبێت شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دووروە بێ سنوور.

لەبەرئەوە موسڵمانان پێویستە بزانن کە نەفی کردنی فەرمانڕەوایی خوای گەورە هۆکاری سەلب کردنی ئیمانە لە مرۆڤ، چونکە خوای گەورە دەسەڵاتداری ڕەهای هەردوو دونیایە، تەنیا ئەو پەروەردگاری جیهانو دەسەڵاتداری ڕۆژی دواییو خاوەنی مرۆڤو فەرمانڕەوای ڕاستو پیرۆزو خاوەنی موڵکەو بەخشێنەری پێغەمبەرایەتی هەر ئەوە.

لەبەرئەوە خوای گەورە لە حکومەتی تاغوت (**طاغوت**) کە بە غەیری نێردراوی خوا حوکم دەکەن ڕازی نییە، بەڵکو تەنیاو تەنیا پیاوچاکانی کار جوان شایستەی حکومەتن لەسەر زەوییدا، هەربەم هۆیەوەیە کە سولەیمان (**علیه السلام**) ئەوە داوا دەکات ﴿قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾ (**ص**: ٣٥). واتە: وتی ئەی پەروەردگار لێم خۆشبەو دەسەڵاتێکم پێ بدە کە دەست نەدات بۆ کەسی تر لە دوای خۆم، چونکە بە ڕاستی تۆ بەخشێنەری هەموو نازو نیعمەتێکیت.

ئەگەر فەرمانڕەوایی بۆ موسڵمان ئەرکێکی پەسەند کراو نەبێت چۆن سولەیمان (علیه السلام) ئەوە لە خوای گەورە داوا دەکات؟

بە هەمان شێوە دەربارەی بنەماڵەی ئیبراهیم (**علیه السلام**) دەفەرموێت: ﴿أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ٥٤﴾ (**النساء**: ٥٤) واتە: یان (هەر ئەوەیە) کە حەسودی بە خەڵکی دەبەن لەسەر ئەوەی خوا لە فەزڵو بەخششی خۆی بەشی داون، خۆ بێگومان ئێمە بە نەوەی ئیبراهیم (**علیه السلام**) کتێبمان بەخشیوە و لە جۆرەها دانایی بەهرەمەندمان کردوونو دەسەڵاتو پاشایەتیەکی گەورەمان پێداون.

موسا پێغەمبەر (علیه السلام) بوونی حكومەت بۆ گەلەكەی بە نیعمەتێكی خوای گەورە ئەزانێ كە پێویستە سوپاسی خوای لەسەر بكەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (**المائدة**: ٢٠). واتە: هەر بەو جۆرە بوو كە موسا بە گەلەكەی وت: ئەی گەلەكەم یادی نازونیعمەتی خوا بكەنەوە لە سەرتان كە پێغەمبەرانی لەناو ئێوەدا فەراهەم هێناوە، هەروەها دەسەڵاتداری زۆری لە ناوتانا هەڵخستووەو ئەوەی بە ئێوەی بەخشیوە بە كەسی تری نەبەخشیوە لە دنیادا (ئەو سەردەمە).

سەرئەنجام ئەوەیە كە خوای گەورە بەڵێنی داوە كە حكومەتی یەكتاپەرست (توحید) سەرانسەری زەوی بگرێتەوە ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ (**النور**: ٥٥) واتە: خوا بەڵێنی دڵنیابەخشو تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو كارو كردەوەی چاكیان ئەنجام داوە، بەراستی لە ئایندەدا جێنشینو پایەداریان دەكات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی نیشتەجێ كردووە، ئەو ئاینەیان بۆ دەچەسپێ كە خوا لێی رازییە، هەروەها ترسو بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامیو هێمنی، ئەو كاتە ئیتر بە تەواوی بە تەنها من دەپەرستنو هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵو شەریكێكم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەدارییە بێ باوەڕ بێت ئەو جۆرە كەسانە هەر تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

سوپاسو ستایش بۆ خوای جیهانیان

دوا رۆژو سەرئەنجام هەر بۆ لە خواترسانە.

وەرگێڕ

## سەرەتا

سوپاس‌و ستايش بۆ خواى جيهانيان درودو سلاو بۆ سەر پێشەوامان موحەممەد و بنەماڵەو سەرجەم يارانو هاوەڵان.

ئەم پەرتوكە لێكۆڵينەوەيەكە دەربارەى فەرمانڕەوايى‌و جێگاى تاك تيايدا لە روانگەى شەريعەتى ئيسلامەوە، لە نووسينى ئەم پەرتووكەدا پشتمان بەستووە بە دەقى قورئانى پيرۆزو رەوش‌و سوننەتى پاكى پێغەمبەر ﷺ و كۆششى ياساناسان (**الفقهاء**) و گەواهييە مێژووييەكانى موسڵمانان.

**ئەم لێكۆڵينەوەيەمان لە سێ بەشدا رێكخستووە:**

**يەكەم:** روونكردنەوەى جێگەى حكومەت لە شەريعەتى ئيسلامدا لە روانگەى پێويستى بنچينە دانانەوە، ماهيەت‌و ئامانجەكانى‌و ...

**دووەم:** روونكردنەوەى جێگەى قانونى تاك لە حكومەتدا لە روانگەى مافەكانيانەوە كە پێويستى تيايدا بەشدار بێت.

**سێيەم:** كۆمەڵە مافێكى حكومەت لەسەر تاكەكان.

هيوادارم بەم لێكۆڵينەوە كورتە توانيبێتم خزمەتێكى بچووك ئەنجام بدەم بۆ روونكردنەوەى چەند گۆشەيەك لە گۆشەكانى شەريعەتى ئيسلام لە سيستمى پەيوەند بە بابەتى حكومەت‌و جێگاى تاك تيايدا، بەو ئومێدەى لە فرسەتێكى تردا بتوانم بە تێروتەسەلى بگەڕێمەوە سەر ئەم بابەتەو روونكردنەوەى ئەوانەى پەيوەنديان پێوەى هەيە.

**والله من وراء القصد**

دانەر

## بەشی یەكەم

## جێگەی حكومەت لە شەریعەتی ئیسلامدا

**سەرەتا :**

بە خەیاڵی هەندێك، ئیسلام بانگەوازێكی ئاینییە، كە تەنها پەیوەندی بە رەوشتو رێكخستنی مرۆڤەوە هەیە بە پەروەردگارییەوەو لەمە زیاتر و فراوانتر نییە و لەسەرجەم فەرمانەكانی ژیانو لە دەستەی حكومەت و فەرمانڕەواییدا هیچ پرۆژەیەكی نییە.

ئەم بۆچوونە راست نییە، شەریعەتی ئیسلام وەك بەو شێوەیەی لە خوارەوە روون دەبێتەوە رەتی دەكاتەوە و وەری ناگرێت.

**١. دامەزراندنی حكومەت لە ئامانجەكانی شەریعەتی ئیسلامە**

یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی شەریعەتی ئیسلام فەراگیریو شمولییەتیەتی و هیچ شتێكی لە ژیاندا بەجێ نەهێشتووە و فەرمانێكی لە بارەیەوە بۆ دەركردووە، هەر بەم هۆیەوە كە لە ناوەڕۆكی دەقە ئیسلامییەكاندا بڕیارەكانی پەرستشو رەوشتەكانو بیروباوەڕو مامەڵە، بە واتا گەورەو فراوانەكەی بەرجەستە دەبن، كە هەڵگری یاساو سیستمی پەیوەندییە كەسایەتییەكانن، بەشێوەی تاكە كەس، یان كۆمەڵ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ (**الانعام**: ٢٨) واتە: ئێمە هیچ شتێكمان پشتگوێنەخستووە لە قورئاندا).

ئەگەر بەو شێوەیە ئیسلام خاوەنی ئەو گشتگیرییە بێت ئاشكراو بەڵگەنەویستە كە لە چوارچێوەو بڕیارەكانیدا بابەتی پەیوەست بە حكومەتو سیستمی فەرمانڕەوایی لە رەگەزی بنەمای پرسو را (أصل الشورى) و ئەركی فەرمانڕەوایان و پێویستی فەرمانبەرداریكردن لێیان لە چاكەدا و یاساكانی جەنگو ئاشتیو پەیمانەكان بەرجەستە ئەبن.

بەم شێوەیە و لەسەر ئەمانە ئەتوانرێت ئەو بڕیارانە بەناوی بڕیاری حكومیو ئەركە حكومییەكانەوە ناو ببرێت.

لە ڕەوش‌و سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ بەهەمان شێوە چەند دەستەواژەیەکی وەك (أمیر، إمام، سُلطان) بەکارهێنراون، کە ئەم دەستەواژانە ئاماژە بە کەسێك دەکەن دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی لە دەستدا بێت، کە هەمان حکومەتە، بەواتایەکی تر فەرمانڕەوایی لە پایە گرنگەکانی حکومەت دێتە ئەژمار، دوودڵی ناوێت، کە ئەم دەقە پێویستە بەشێوەیەکی کرداری جێبەجێ بکرێت، چونکە ئامانج لە هاتنە خوارەوەی ئەم دەقە لە ڕێگەی نیگاوە (وەحی) ئەوە نییە کە تەنها بخوێنرێتەوەو پاشان وازیان لێبهێنرێت، بەڵکو ئامانج تیایاندا ئەوەیە کە بخوێنرێنەوەو پاشان پیادە و جێبەجێ بکرێن، پیادە کردنیشیان واتە دامەزراندنی حکومەت لەسەر بونیادی چەمك‌و واتایەك کە شەریعەت هێناویێتی.

**٢. کۆمەڵە ئەرک‌و فەرمانێک کە پیادەکردنیان پابەندی پێکهێنانی حکومەتە:**

لە ئاینی ئیسلامدا کۆمەڵێك بڕیار (أحكام) وەك: تۆڵەسەندنەوە، پێویستییەکانی فەرمانڕەوایی لە نێوەندی خەڵکیدا لەسەر بنەمای ئەوەی کە خوای گەورە ناردویێتی‌و خەبات کردن لە پێناوی خوای گەورەدا و چەندەها شتی تریش کە خەڵکی ناتوانن جێبەجێی بکەن، پیادەکردنی تۆڵەسەندنەوە لەسەر ئەو ماهیەتەی کە کەسان هەیانە، تەنها حکومەت بە بەڵگەی هێزو دەسەڵات ئەتوانێ پیادەی بکات‌و تاکەکان خۆیان ناتوانن ئەنجامی بدەن، پێشەوا (ئیبن تەیمیە) لەم بارەوە دەفەرموێت: (سەرپەرشتی کردنی کاروبارەکانی خەڵکی لە گرنگترین ئەرکە دینییەکانە، کە ئەگەر بە هۆی ئەوە نەبێت دینداری بە دامەزراوی نامێنێتەوە، هەر لەم ڕوانگەیەیشەوە کە خوای گەورە فەرمان بە چاکەو قەدەغەی خراپەو یارمەتی ستەملێکراوو چەندەها بابەتی تری وەکو جیهادو دادپەروەری‌و بەجێهێنانی سنوورەکان‌و... کە بەبێ بوونی دەسەڵات و حکومەت پیادەناکرێن، واجبی کردوون).[١]

لەبەرئەوە هەستانی حکومەتی ئیسلامیی لە پێناو پیادەکردنی بڕیارە شەرعییەکاندا داخوازییەکی پێویستە.

---

١) السياسة الشرعية، إبن تيمية، ص١٧٢ـ ١٧٣.

**٣. بەجێهێنانی بەندایەتی خوای گەورە پابەندی پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامییە:**

خوای گەورە مرۆڤی بۆ بەندایەتی خۆی دروست کردووەو دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (**الذاريات**: ٥٦) واتە: بێگومان من پەریو ئادەمیزادم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستنو فەرمانبەردارم بن).

بەندایەتی (**العبادة**) ناوێکی کۆکەرەوەیە، بۆ هەرچییەکە کە خوای گەورە خۆشی ئەوێت، لە وتە و کردار، بەنهێنیو ئاشکرا.[١] بەجێهێنانی واتای بەندایەتی لەم چەمکە فراوانەدا داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ تەواوی ژیانی، لە رووی وتەو کردەوەو هەڵسوکەوتو پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکی دا، بەو جۆرە شێوازانە جێبەجێ بکات کە ئیسلام پێناسەی کردووە.

مرۆڤ ناتوانێت ئەم شێوە ژیانە بهێنێتە ئاراوە، مەگەر کۆمەڵ ئەم جۆرە ژیانەی بۆ ئاسان بکەنو ئەم ژینگەیەی بۆ برەخسێنن، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو بە تەواوی ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا دەژی کاریگەرە لەسەری.

ئەنجام ئەم کارتێکردنە ئەتوانێ خواستی چاکەو رێنمایی، یا رێگەی خراپەو گومڕایی بێت، پاڵپشتی ئەم بابەتە لەم فەرموودەیەی خوارەوەدا پەنهان کراوە.

(**ما من مولود يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه وينصرانه ويمجسانه، كما تنج البهيمة بهيمة جمعاء هل تحسون فيها من جدعاء حتى تكونوا أنتم تجدعونها**).[٢] (هیچ کۆرپەلەیەك لە دایك نابێ بە سروشتی ئیسلامو لەسەر فیترەت نەبێ، لە پاشدا دایكو باوکی ئەیکەن بە (جولەکە، یان گاور، یان ئاگرپەرست) وەك چۆن ئاژەڵێك لە ئاژەڵێکی تر بەشێوەیەکی تەواو لە دایك دەبێت، ئایا ئەبینن گوێچکەی براپێت، تا ئێوە خۆتان گوێچکەی نەبرن؟).

---

١) فتاوى إبن تيمية.

٢) المنتخب من السنة، ص٢٩١.

کەواتە دایك‌و باوك لە پەیوەندییاندا لەگەڵ منداڵەکانیاندا وەك کۆمەڵگەیەکی بچوکن، ئەگەر ئەوان گومڕا بن ئەوا بەرەو کەناری گومڕایی ئەبەن‌و لەو سروشتە خاوێنەی کە خوای گەورە بۆی بەدیهێناوە دووری دەخەنەوە، ئەگەر هەردووکیان چاکەخوازبن ئەوا لەسەر سروشتی خوایی دەیبەڵنەوەو بزاڤی چاکە تیایدا شکۆفە دەکات.

لەبەرئەوە ئەوەی کە لە قورئاندا پیرۆزدا هاتووە ئەوەیە کە کۆمەڵگای خراپە کار رێئەگرن لە هەستان بۆ ئەرکێك کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە، لەم کاتەدا تاکی موسڵمان ناتوانێ بە پێی داخوازی ئیسلام لەم ناوەندەدا بەردەوامی بە ژیان بدات‌و کۆچ و گۆڕینی شوێن‌و جێگاکەی لەسەر پێویست دەبێت، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ (**النور**: ٩٧). واتە: بە راستی ئەوانەی فریشتەکان لە سەرەمەرگدا گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان کردووە، دەڵێن ئێوە لە چیدا بوون‌و لە کوێ ژیانتان دەبردە سەر، لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێدەسەلات‌و لاواز کرابووین لەسەر زەوی خۆماندا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان و پان‌و پۆڕ نەبوو تاکو کۆچی تیادا بکەن؟ ئەوان جێگەیان دۆزەحە کە سەرئەنجامێکی خراپ‌و پڕ لە ناخۆشییە).

ئیبن کەسیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە بە شێوەیەکی گشتی هاتۆتە خوارەوە، هەرکەسێ لە سنووری دەسەلات‌و قەڵەمڕەوی موشریکەکاندا بژی‌و توانی کۆچکردنی هەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانێ بە تەواوی ئاینەکەی جێبەجێ بکات، ئەگەر کۆچ نەکات بەرای کۆمەڵێ زانایان ستەمی لە نەفسی خۆی کردووەو خۆی تووشی حەرام کردووە).[1]

لەبەرئەوە تا ئەو کاتەی بونیادی کۆمەڵ لەسەر بنچینەی بنەما ئیسلامییەکان دانەمەزرێ، تاك ناتوانێ هاوڕێکی زانیارییە ئیسلامییەکان بژی‌و پەیوەندییش لەگەڵ خەڵکیشدا لەسەر

---

١) تفسیر إبن کثیر.

بنەماو چوارچێوەی شەریعەت رێك بخات، مەگەر دەرفەتی ژیانی بۆ پیادەکردنی بنما ئیسلامییەکان بۆ دەستە بەر ببێ و ژینگەیەکی تەواوی بۆ سەرجەم بەندایەتی کردنی بۆ رێك بخرێت.

لە راستییدا رێکخستنی کۆمەڵگا لەسەر رەوشی ئیسلام تەنها بە ئامۆژگاریو هۆشیاری نایەتە دی، بەڵکو پێویستە حکومەتێ پێکبهێنرێت کە کۆمەڵگا بەرەو باری داواکراو ئاڕاستە بکات، حکومەتێك کە دەسەڵات پەیدا بکاتو پارێزگاری لە کیانو قەوارەی خۆی بکاتو بتوانێت بوەستێت لە رووی کەسانێکدا کە لە نیازی رووخاندن و نابود کردنیدان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ (**الحديد**: ٢٥). واتە: بەراستی بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان رەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەی روون و ئاشکرادا و لەگەڵیاندا کتێبی ئاسمانیو تەرازوو پێودانگیشمان ناردووە تا خەڵکی بە دادپەروەریی رەفتار بکەن و ئاسنیشمان بەدیهێناوە کە لەودا سەختیو هێزی توند هەیە و سودیشی بۆ خەڵکی هەیە تا خوا روونی بکاتەوە کە چی کەسێك بە نهێنی یارمەتی و پشتیوانی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، بەراستی خوا بە هێز و بالادەستە.

لەبەرئەوە کەسێك کە بە هۆی رێنمایی قورئانەوە بیرنەکاتەوە و تێ نەگات ئەوا پێویستە بە هێز و ـ ئاسن ـ لە گومڕاییو خراپەکاریو فەسادی بگەڕێنرێتەوە ئیتر هیچ کەسێك ناتوانێت کەشتییەکە کون بکات و سەرنشینەکانی نگرۆ بکات.[١]

وە هێزی کاریگەر کە کۆمەڵگا لە لەناوچوون و لادان ئەپارێزێت هەمان حکومەتە بە سوودوەرگرتن لەو هێز و دەسەڵاتەی کە هەیەتی، وەك چۆن لە ریوایەتێکدا هاتووە: (إن الله

---

١) ئاماژەیە بەو نموونە جوانەیەی پێغەمبەر ﷺ کە (کۆمەڵێك لەناو کەشتییەکدا بوون، یەکێك لە سەرنشینەکانی ئەو جێگەیەی کون ئەکرد کە تیایدا دانیشتبوون، ئەیوت ئێرە جێگەی منەو جگە لە من مافی هیچ کەسێکی تر نییە، سەرئەنجام کەشتییەکە غەرق بوو، ئەگەر خەڵکی پێشیان لەو کابرایە بگرتایە ئەوە رووی نەئەدا، پێغەمبەر فەرمووی کۆمەڵ وەك ئەو کەشتییە وان، هەموان لەبەرامبەر یەکتردا بەرپرسیارن.

**ليزع بالسلطان ما لا يزع بالقرآن).**[1] واتە: بەراستی خوا بەرگریی لە شتێك دەكات بە هۆی هێز و دەسەڵاتەوە كە بە هۆی قورئانەوە بەرگریی لێ نەكات.

**٤ـ پێغەمبەر ﷺ هەستاوە بە پێكهێنانی حكومەتی ئیسلامی:**

لێرەدا كە شەریعەتی ئیسلامی خۆی بۆ خۆی پابەندە بە پێكهێنانی حكومەتێكی ئیسلامییە و فەرمان بە بەدیهێنانی دەكات، بۆیە ئەبینین پێغەمبەر ﷺ بۆ رێكخستنی حكومەتێكی لەو جۆرە دەست دەداتە سەرەتاكانی دامەزراندن و هەوڵی بۆ دەدات، سەرەتاكەیشی دووەمین پەیمانی (عەقەبە) بوو، كە لە پێش كۆچكردنیدا بۆ مەدینە بەسترا، كورتەی ئەم رووداوە گرنگە وەك لە پەرتوكەكانی سیرەدا هاتووە ئەوەیە كە كۆمەڵێك لە موسڵمانانی مەدینە كە ژمارەیان (٧٣) پیاوو (٢) ژن بوو لە نزیكی مەككەدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دیدارێكیان ئەنجامدا لە كۆتایی ئەم پەیوەندییە مێژووییەدا پێغەمبەر ﷺ وتارێكی پێشكەش كرد و بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریی كردن لە خوای گەورە فەرمانی دا لە پاشدا هەندێكیان قسەیان كردو بە یەكەوە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر چی پەیمان (بەیعەت)ت پێ بدەین؟ فەرمووی: (پەیمانم پێبدەن بە گوێڕایەڵی كردنو فەرمانبەرداریی لە خۆشی و ناخۆشییدا، فەرمان كردن بە چاكە و قەدەغەی خراپە، بەرگریكردن لە دینی خواو لە پێناوی خوادا لە سەرزەنشتی تەوانجدەران نەترسن، وە یارمەتیم بدەن و هەركات بەرەو لاتان هاتم پارێزگاریم لێ بكەن وەك چۆن پارێزگاری لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان دەكەن، ئەگەر ئەوەتان بەجێ هێنا ئەوە بەهەشت ئەبێتە جێگاتان)، پاشان بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ رۆشتن و لەسەر ئەو خاڵانە پەیمانیان لەگەڵ بەست.[2]

بۆیە ئەم پەیماننامەیە پەیماننامەیەكی راشكاوو یەكلاكەرەوە بوو لە نێوان پێغەمبەرو ئەواندا لە پێناو دامەزراندنی یەكەمین دەوڵەتی ئیسلامییدا، وە بەخشینی فەرمانڕەوایی بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە سەركردەوە هەیە لە بەڕێوەبردنی

---

١) ئەم رستەیە لە ئیمامی عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە.

٢) سيرة إبن هشام.

حکومەتە تازەکەدا و پێویستی پاراستن و پارێزگاری کردن لە سەرکردە و ئەو سەرزەمینە تازە (کە پارێزگاری کردنە لەهەمان حکومەت)و پابەندی پەیماندەران بە فەرمانبەرداری لە پێغەمبەر ﷺ بە روونی و راشکاوی لە پەیماننامەکەدا هاتووە.

بەم جۆرە لایەنگری لە سیستمی ئەم حکومەت بەوشێوەی کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە: (لەسەر فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغەی خراپە پەیمانم پێ بدەن) ئەوە روون دەبێتەوە کە پارێزگاری کردن لە حکومەت هەمان پارێزگاری کردنە لە یاسای ئیسلام.

## پێکهێنانی یەکەمین حکومەتی ئیسلامی لەسەر زەویدا

لە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە و فەرمانی بە هاورێ دڵسۆزەکانیشی کرد کە کۆچ بکەن، کاتێك کە پێی فەرموون: (بەراستی خوای گەورە کۆمەڵێکی کردووە بە برای ئێوە و سەرزەمینێکیشی بۆ ئامادەکردوون کە تیایدا دەگەن بە ئارامی)، پێغەمبەر ﷺ لە دوای جێگیربوونی لە مەدینەدا و دروستکردنی مزگەوت تیایدا (پەیمانێکی لە نێوان کۆچکردووان (مهاجرین) و پشتیواناندا (أنصار) بەستو جولەکەکانی تیایدا بەشدار نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوانیشدا پەیمانێکی ئیمزا کرد، کە ئەتوانن لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە و سەروەت و سامانیشیان پارێزدراو دەبێت، وەچەند مەرجێکی دەست نیشان کرد بۆیان).(١)

بەم ریزبەندە یەکەمین حکومەتی ئیسلامی پێکهات و پێغەمبەری خوا ﷺ بووە یەکەمین فەرمانڕەوای.

پەیماننامەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جولەکەدا، بەیانگری رواڵەتی ئەو توانا سیاسییانەیە کە راستەوخۆ لە تایبەتمەندییەکانی فەرمانڕەوایی حکومەتی ئیسلامی دامەزراو لە مەدینەدا وەریگرتووە پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستا بە رێکخستنی دەستەی ناوخۆیی و لە نێوان کۆچکردووان و یارمەتیدەراندا پەیمانی برایەتی بەست بە شێوازێك کە لەسەر بنچینەی

---

١) سیرة إبن هشام.

ئەم برایەتییە (میرات)یان لە یەکتر ئەبرد تا کاتێك ئەم فەرمانە بە هۆی بڕیاری میراتەوە هەڵوەشایەوە.[1]

## داڕێژتنی ڕەگەزەکانی حکومەت

لە زاراوەی یاسایی ئەمڕۆدا حکومەت چەند پێناسەیەك ئەکرێت:

(چەند کۆمەڵێك لە تاکی ڕێکخراوەیی کە خاوەنی فەرمانڕەواو قەڵەمڕەوێکی دیاری کراوو خاوەنی مافی کەسێتی بن).[2]

کەواتە ڕەگەزەکانی پیکهێنانی حکومەت بریتین لە:

١ـ کۆبوونەوەی کۆمەڵە خەڵکێك.

٢ـ بوونی سیستمێکی تایبەت.

٣ـ نیشتەجێی لە سنوورێکی جوگرافیی دیاری کراودا.

٤ـ بوونی فەرمانڕەوا.

٥ـ خاوەنداری کەسایەتی قانونی.[3]

هەموو ئەم ڕەگەزانە لە یەکەمین حکومەتی ئیسلامی دا کە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا بونیادی نا هاتبوون.

کۆبوونەوەی کۆمەڵێك خەڵك، کۆچکردووان و یارمەتیدەران بوو، سیستمێك کە بووە بابەتی وەرگیراوی ئەو کۆبوونەوەیە شەریعەتی ئیسلام بوو بە سەرجەم بڕیار و یاساکانییەوە، سەرزەمینێك کە ئەو کۆمەڵەی تێیدا نیشتەجێ بوون مەدینە بوو، فەرمانڕەواکەشی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە ڕاستەوخۆ لەو حکومەتە ئیسلامییەدا، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و بەرژەوەندییە گشتییەکان نەقشی ڕابەری لە ئەستۆ گرت، بە هەمان شێوە کەسێتی یاسایی ئەو کۆمەڵەش ئاشکرا بوو.

١) البداية والنهاية، إبن كثير.

٢) (شرح القانون الدستوري) د. مصطفى كامل.

٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لەبەرئەوە ئەو پەیماننامانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە جێگەی رابەری حکومەتدا ئەیبەست، حکومەتەکە بە شێوەیەکی گشتی ئەو پەیماننامانەی ئەبەست نەك کەسایەتی پێغەمبەر بە تەنهایی.

## کۆبوونەوەی دوو تایبەتمەندی لە خودی پێغەمبەردا ﷺ

## پێغەمبەرایەتی و دادوەری

لەگەڵ پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامییدا لە مەدینە، هاوکات پێغەمبەر ﷺ خاوەنی چەند تایبەتمەندییەك بوو، پێغەمبەرایەتی و راگەیاندنی فەرمانەکانی خوای گەورەو نیشانەی دادوەری کە لە نێوان خەڵکیدا هەڵدەسێ بە کاری دادوەری وە لەسەر ئەم بنەمایە لەودا دوو هێزی بەجێهێنان و دادوەری کۆبووبوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی و نێردراوی لە لایەن خواوە، خەڵکی رائەگەیاندن.

یاساناسەکان بە دڵنیاییەوە بە کۆبوونەوەی ئەم تایبەتمەندییانە لە خودی پێغەمبەردا ﷺ پەییان بردووە، بڕیارو هەرچییەك لە لایەن پێغەمبەرەوە دەرکرابێت، بە گوێرەی هەریەکێك لەو تایبەتمەندییانە روونیان کردۆتەوە.

لەسەر بۆچوونی ئەوان لە راگەیاندنی یاسای خودا هەرچییەك لە رەوشتی پێغەمبەرایەتی سەرچاوەی گرتبێ بە وێنەی بڕیارێکی گشتی و یاسایەکی پێویست بە جێبەجێ کردنە بۆ هەموو تاکەکان.

ئەوەی کە بە رەوشتی پێشەوایەتی (**صفه امامه**) لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ ئەو ئەنجامە جگە لە سەرۆکی حکومەت، یان مۆڵەت پێدانی لە لایەن سەرۆکەوە بۆ کەسێکی تر رەوا نییە.

هەروەها ئەوەی کە بە هۆی تایبەتمەندیی دادوەرێتییەوە (**قاضي**) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە ئەنجامدانی بۆ هیچ کەسێك رەوا نییە جگە بە بڕیاری دادوەر.

جیاوازی یاساناسەکان (**فقهاء**) لە ئیجتیهاددا لەسەر ئەوەیە کە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە هاتووە پەیوەندی بە کام تایبەتمەندییەوە هەیە پێغەمبەرایەتی، پێشەوایەتی، یان دادوەری.

یەكێك لە نموونەكانی جیاوازی (ڕێگەپێدان لە لایەن پێشەواوە بە خستنە ژێر ركێفی زەوییە مردووەكان لە پێناو بوژاندنەوەیاندا)یە هەموو یاساناسەكان لەسەر ئەم فەرموودە كۆكن كە دەفەرموێ: (من احيا **أرضا ميتة فهي له**)، بەڵام جیاوزییان لەو ڕەوشتەدا (صفه) هەیە كە بە هۆی ئەم فەرموودەیەوە بەیان كراوە.

هەندێك باوەڕیان وایە ئەم بڕیارە وەك فتواو ڕاگەیاندن ڕوونكراوەتەوە هەموو كەسێك ئەتوانێت زەوی مردو ببوژێنێتەوە چ پێشەوا (سەرۆكی حكومەت) ڕێگەی پێبدات، یا ڕێگەی نەدات، ئەمەش ڕەوشی (**مذهب**)ی پێشەوا (شافیعیو مالیك)ە.

كۆمەڵێكی تر دەڵێن ئەم فەرموودەیە بەیانگری هەڵسوكەوتێكە لە لایەن پێغەمبەرەوە لە پلەی پێشەوایەتیی دا (امامە) واتە بە ڕەواجی (سەرۆك حكومەتی)، بۆیە بۆ هیچ كەسێك ڕەوا نییە زەوی مردو ببوژێنێتەوە، مەگەر لە لایەن سەرۆكی حكومەتەوە ڕێگەی پێبدرابێ، ئەمەش ڕەوشی پێشەوا ئەبوحەنیفەیە.

**٥ ـ لە زاراوەی یاساناسەكاندا (دار الاسلام) هەمان حكومەتی ئیسلامییە:**

لە زاراوەی یاساناسەكانی ئیسلامدا حكومەتی ئیسلامیی بەناوی (دار الاسلام) ناوبراوە، كە وەرگێڕانی هەمان چەمكە كە وشەی (حكومەت) لە زاراوەی قانونی ئەمڕۆدا هەیەتی و ئەم واتایە لە كۆمەڵە پێناسەیەكدا ڕوون ئەبێتەوە كە دەربارەی (دار الاسلام) وتراون.

ئەم پێناسانە ئەگەرچی هەندێك لە ڕەگەزەكانی حكومەتی بە گرنگی جێگیر كردووەو لەوانی تر چاوپۆشی دەكات، بەڵام ئەو بابەتانەی كە بە ناوی ڕەگەزەكانی حكومەتەوە باسیان لێ دەكات، بە هەمان شێوە بابەتە چاو لێ پۆشراوەكانیش لە خۆ دەگرێت یەكێك لەو پێناسانە (دار الاسلام ناوی سەرزەمینێكە كە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی موسوڵماناندا بێت).[١]

لەم پێناسەیەدا هەندێك ڕەگەزی وەك لە ژێر فەرمانڕەوادا بوون و سنووری جوگرافی دەبینرێت، سەرجەمی ڕەگەزەكانی تری وەك كۆبوونەوەی خەڵك و قانونیشی لە خۆ گرتووە، چونكە لەسەر موسڵمانان پێویستە هەر كاتێك فەرمانڕەواییان گرتە دەست قانونی ئیسلام

١) شرح السير الكبير، السرخسي.

جێبەجێ بکەن. بە واتایەکی تر (دار الاسلام) سەر زەوییەکە کە بە هۆی هێز و دەسەڵاتی موسڵمانانەوە، ئارم و ڕەمزە ئیسلامییەکانی تیادا دەربکەون.[1]

لەم پێناسەدا سیستمی حکومەت و دەسەڵاتی موسڵمانان ئاشکرایەو هەڵگری سەرجەمی ڕەگەزەکانی تریشە، وەك خەڵك و سەر زەوی...

بەوشێوەیە دەبینین پێکهێنانی حکومەت مەرج نییە لەسەر ئەوەی کە سەرجەمی دانیشتوانی سنوورە جوگرافییەکەی موسڵمان بن، بەڵکو لە ناویاندا ناموسڵمانیش (غیر المسلمین) بوونی دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە یاساناسەکان ڕوونیان کردووەتەوە کە (ذمي: هاووڵاتییەکی غەیرە موسڵمانی دانیشتوی (دار الاسلام)ە).[2]

لەبەرئەوە مەرج لەسەر موسڵمان بوونی سەرجەمی خەڵکەکەیدا نییە، بەڵکو مەرج لە پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامی دا ئەوەیە کە فەرمانڕەواکەی موسڵمان بێت‌و یاساکانی ئیسلام جێبەجێ بکات، پێشەوا (رافعی) لەم بارەوە دەفەرموێت: مەرجی بە (دار الاسلام) بوونی شوێنێك ئەوە نییە کە موسڵمانان لەوێدا کۆبووبێتنەوە، بەڵکو مەرج ئەوەیە دەسەڵات بە دەستی موسڵمانانەوە بێت.[3]

## ماهیەتی حکومەتی ئیسلامی و ئامانجەکانی

حکومەتی ئیسلامیی حکومەتێکی ئایدۆلۆژییە کە لەسەر بنەمای عەقیدەی ئیسلامی و هەموو ئەو دیسپلینانەی لە بڕیار و یاساکانییەوە سەرچاوە دەگرێت پێکدێت، لەبەرئەوە حکومەتێکی ناوچەیی سنووردار کراوی جوگرافی نییە، هەروەها حکومەتێکی میللی و پەیوەندیدار نییە بە قەوم و نەژادەوە، بەڵکو حکومەتێکی عەقیدەییە کە درێژی سنوورەکانی پاشکۆی فیکر و بیروباڕی ئەون و لەو حکومەتەدا بەرزگیری (امتیاز) لەسەر بونیادی ڕەنگ و نەژاد و سەرزەوی بوونی نییە، ئەمە ماهیەتی حکومەتی ئیسلامییە کە

---

١) شرح الازهار.

٢) (البدائع الصنايع)، كاساني. (المبسوط)، السرخسي.

٣) فتح العزيز.

بە شێوەی سیستمێکی جیهانی نەتەوەکان و نەژاد و گەلە جیاوازەکانی لە کەناری یەکتردا جێگر کردووە و کەسێك ئەو بیروباوەڕە پەسەند بکات لە ئوممەتی ئیسلامی ئەژمێردرێت و هەرکەسێکیش پەسەندی نەکات ئەتوانێ لە سایەتی سیستمی یاسایی ئیسلامدا درێژە بە ژیان بدات و یەکێك بێت لە هاووڵاتیان و دەتوانێت لەسەر رەوش و رەوگەی خۆی بمێنێتەوە بەبێ ئەوەی بکەوێتە ژێر هیچ فشارێکەوە لەلایەن حکومەتەوە.

ئەو ئامانجەی کە ئەم حکومەتە بە دواییدا دەچێت لە خودی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەسەر بنچینەی ئیسلام بونیاد نراوە، بەم پێیە حکومەتێکی عەقیدەییە ئامانجەکانی هەمان ئامانجی ئیسلامە و ئامانجەکانی کورت نەکراوەتەوە بە بەرجەستە کردنی ئاسایشی تاكو پارێزگاری لە ژیانیان، یا رووبەڕووبوونەوەی دوژمنە دەرەکییەکان، بەڵکو ئامانجەکانی درێژە دەکێشێت تا پیادەکردنی بڕیارە ئیسلامییەکان لە سەرجەمی بوارە حکومەتییەکانداو گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام بە سەرتاسەری جیهان.

لەسەر حکومەتی ئیسلامی پێویستە کۆمەڵە مەرجێك دابین بکات تا تاکەکان بتوانن هەستن بە پەرستشی خوای گەورەو لەسەر رەوشی بیروباوەڕی ئیسلامی و یاسا ئیسلامییەکان بژین و ئەو رێگرانەی بەر لەم ئامانجانە دەگرن لابرێن و هەرچییەك فاکتەری مەترسی و خەلەل و خراپەیە لەبەردەم بیر و دەسرازەی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئیسلامدا چارەسەر بکرێن، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾ (**الحج**: ٤١). واتە: ئەوانەی ئەگەر پایەدارمان کردن لە سەر زەویی دا نوێژ و دروشمەکانی بە چاکی رادەگرن، زەکاتیش بە تەواوی دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

بەم پێیە بەجێهێنانی نوێژ بەیانگری توانای تاکە لە پەرستنی خوای گەورەدا و فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغەی خراپە نیشاندەری دەسەڵاتی تاکە لە گرتنە بەری رێگەی ژیان لەسەر بنەمای دەستوورەکانی ئیسلامو بەجێهێنانی بڕیارەکانی لە بوارە حکومەتییەکاندا، ئەمانە

ئامانجەكانی حكومەتی ئیسلامی و سەرجەمی ئەمانەش بەو شێوازانەی كە خوای گەورە فەرمانی پێداوە ئەگەڕێتەوە بۆ چاودێریی كردنی بەرژەوەندییەكانی تاك و كۆمەڵگا.

كەواتە بەم پێیە حكومەت لە گرتنەبەری بەرژەوەندییەكانی ئێستە و داهاتووی تاكدایە.

## بەشی دووهەم

## مافەكانی تاك لە حكومەتی ئیسلامییدا

**سەرەتا**

لە حكومەتی ئیسلامیدا جێگەی تاك دیاری كراوەو لە ناویدا ناتوێتەوە، بەڵكو تاك لە پاڵیدا دەوەستێ‌و هاوكاری دەكات و لە رووی ماناوە و چاكەی ئەودا كار دەكات، وەك چۆن كە حكومەتی ئیسلامیش بە هەمان شێوە بۆ مانەوەی كەسایەتی تاكو بەرژەوەندییەكانی لە هەوڵ و كۆشش دایە، چونكە مانەوەو بەرژەوەندی هەریەك بۆ ئەوی تر پێویستییە و لە نێوەندیاندا هیچ جۆرە دژایەتیی و ركەبەرایەتییەك بوونی نییەو هیچ بەرژوەندییەكیش لە دژایەتی‌و سەرپێچی ئەو دوانەدا بەرامبەر بەیەك نابینرێت، هەندێك سەرپێچی و دژایەتی پێ‌ ئەچێ‌ روو بدات لە هەندێك بابەتدا كە یەكێك لەو دوانە لە بنەمای ئیسلام لابدەن كە پێویستە هەردووكیان تەسلیمی بن لەم روانگەوە لە حكومەتی ئیسلامییدا تاك لە هەموو ئەو مافانەدا بەهرەمەند دەبێت كە ئیسلام بۆی دیاری كردووە، چونكە حكومەتی ئیسلامی بە وردی ئەو شتانە پیادە دەكات كە ئیسلام دیاری كردووە، بەم جۆرە تەنها ئەگەر تاك بەشێوەیەكی تەواو بەهرەمەند بێت لە مافەكانی خۆی ئەمە گەورەترین پشتیوانەی پایەدارێتی حكومەتی ئیسلامییە و لە پێناو بەدواداچوونی ئامانجەكانیدا بە تواناتر دەبێت. لەم روانگەیەوە حكومەت هەوڵ دەدات تاكەكان مافەكانی خۆیان بەرجەستە بكەن و خوازیاری بەجێهێنانیانە.

بەو بەڵگەیە كە لە ناوچوونی ئەم مافانە هیچ سوودێكی بۆ حكومەت نییە و لە بناغەدا حكومەتی ئیسلامی بۆ ئەوە بونیاد نراوە كە تاكەكان بتوانن درێژە بە ژیانی ئیسلامەتی

خۆیان بدەن، یەكێك لە گرنگترین فاكتەرەكانی ئەم بە توانا بوونە بەهرەمەند بوونی تاكە لە مافەكانی خۆی، بەڵكو پشتیوانی و پارێزگاری كردنیانە تا بەرجەستەی بكەن.

## چۆنیەتی لێكۆڵینەوە

لە پێناو ئاسانتر كردنی ئەم لێكۆڵینەوەدا (مافەكانی تاك لە حكومەتدا) دابەشی دەكەین بەسەر دوو بەش دا، مافە سیاسییەكانو مافە گشتییەكان، بە جیا لەهەر یەكێكیان دەكۆڵینەوە.

## لێكۆڵینەوەی یەكەم

## مافە سیاسییەكانی تاك

### مافە سیاسییەكان

بەبۆچوونی مافناسان بریتییە لە: (كۆمەڵە مافێك، تاك بە بەڵگەی ئەوەی كە ئەندامێكە لە كۆمەڵەیەكی سیاسیی بە دەستی دێنێت، وەك مافی هەڵبژاردنو كاندید بوونو لە ئەستۆ گرتنی ئەركە گشتییەكان لە حكومەتدا).[1]

بە پێناسەیەكی تر: (بریتییە لە كۆمەڵە مافێك كە تاك بە هۆیەوە لە بەڕێوەبردنی كاروبارە حكومەتییەكاندا، یان هاوشێوەی ئەو كاروبارانە، بەشداریی بكات).[2]

لەم بەشەدا (مافە سیاسییەكانی تاك لە شەریعەتی ئیسلام دا) دەخەینە بەر تیشكی لێكۆڵینەوە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو واتایانەدا كە لە دیدگای مافناسانەوە بەیانمان كرد، تا ویست و مەبەستی ئەم مافانەمان بۆ ڕوون ببێتەوە كە شەریعەت ڕەچاوی كردووە بۆ تاكەكان.

---

١) اصول القانون، دكتور سنهوری و حشمت بن شیت.

٢) القانون الدولي الخاص، دكتور جابر جاد.

## یەكەم: مافی هەڵبژاردن

### هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت

هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت یەكێكە لە مافەكانی تاك، هەر كەسێك بۆ ئەم پلەیە هەڵبژێرێت دەبێتە سەرۆكی یاسایی حكومەت.

یاساناسانیش ئەم بابەتەیان روون كردووەتەوە لەوانە دەڵێن: (كەسێك موسڵمانان لەسەر پێشەوایەتی و پەیمان پێدانی یەكدەنگ بن پێشەوایەتییەكەی جێگیر دەبێتو یارمەتیدانی پێویست دەبێت).[1]

هەروەها (پێشەوایەتیو سەرپەرشتی كردنی حكومەت، لە پەیماندانی خەڵكیدا بە سەرۆكی حكومەت جێگیر دەبێت، نەك بە هۆی جێنشین كردن (لەلایەن سەرۆكی پێشووەوە لە رابردوودا)).[2]

بەم پێیە سەرۆكی حكومەت كەسێكە كۆمەڵ هەڵی دەبژێرنو پێی رازین، ئەو دەسەڵاتو فەرمانڕەواییەی خۆی لەم رازی بوون و هەڵبژاردنەوە بە دەست دێنێت.

### بنەمای ئەم مافە:

بنەمای مافی هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت چییە بۆ تاكەكان؟

ئەوەی ئەتوانرێ بوترێ، ئەوەیە كە ئەم مافە لەسەر بنەڕەتی شورا (راوێژ) دادەمەزرێت، ئەو بنەڕەتەی كە شەریعەت بڕیاری لەسەر داوەو سەرچاوەی پەیدابوونی بەرپرسیارییە كۆمەڵایەتییەكانە، لە بەجێهێنانی بڕیارە شەرعییەكان و بەڕێوەبردنی كاروبارەكاندا.

### یەكەم: بنەڕەتی شوورا

ئەم بنەڕەتە قورئانی پیرۆز روونی كردووەتەوە ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ (**الشورى**: ٣٨) واتە: كاروباریان بە راپرسی و راوێژكارییە.

---

١) المغني ابن قدامة الحنبلي.

٢) منهاج السنة النبوية، ابن تيمية.

ئەمە دەقێکی ئاشکرایە لەمەڕ کار و ئیشی موسڵمانانەوە، بە تایبەت کاروبارە گرنگەکان لە ڕێی شوراوە بەڕێوەدەچن، بێگومان پلەی سەرۆکی حکومەتیش یەکێکە لە بوارە گرنگەکان کە پێویستە لەو بابەتەدا راوێژ بەکاربهێنرێ و هەموویان کۆك بن لەسەر گرنگییەکەی و پەیوەستە بە بنەما و بنچینەی کاروبارەکانی ژیانیانەوە.

بۆیە پێویستە مافی رادەربڕینیان هەبێت دەربارەی ئەو کەسەی دەبێتە سەرۆکی حکومەت. هەروەها بۆ زانینی لایەنی ئەو کەسەی، کە دیدگاکان دەیانەوێت بۆ سەرۆکایەتی حکومەت هەڵبژێرن روون بووەوە کە پرسو را پێویستە.

**دووەم: لێپرسراوێتی خەڵک لە بەجێهێنانی بڕیارە شەرعیەکاندا:**

خەڵکی بەرپرسیارن لە بەجێهێنانی بڕیارە شەرعییەکانو بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانەدا بەرامبەر ئەم بڕیارانە، ئەم بەرپرسیاریەش لە ئایەتەکانی قورئاندا روون بووەتەوە و پێشینەی مێژوویی موسڵمانانیش پشتگیریی لێدەکات، وتە و بانگەوازەکانی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا رووبەڕووی موسڵمانان دەبێتەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ **(النساء: ١٣٥)**. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە راگری دادوەری بن‌و شایەتی بۆی خوا بدەن، با شایەتییەکەیشتان بۆ خۆتانو دایكو باوکتانو خزمانیشتان هەبێت.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِ﴾ **(المائدة: ١)**. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەوەفا بن بەرامبەر بە پەیمانەکانتان.

﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ **(التوبه: ٧١)**. واتە: ئیمانداران لە پیاوانو ژنان هەندێکیان خۆشەویستو پشتگیرو هاوکاری یەکترن، فەرمان بە چاکە دەکەنو رێگری لە خراپە دەکەن.

﴿ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ **(الأعراف: ٣)**. واتە: شوێن ئەوە بکەون کە لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دێتە خوارەوە.

﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ﴾ (النور: ٢) واتە: سەد قامچى لە هەريەك لە ئافرەت پياوى (كورِ و كچ)ى زينا كار بوەشێنن.

﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا﴾ (المائدة: ٣٨). واتە: دەستى پياوى دز و ئافرەتى دز ببرِن.

ئەم ئايەتانە و هاوشێوەكانيان بەڵگەيەكى رۆشنن لەسەر لێپرساوى و بەرپرسيارێتى كۆمەڵى موسڵمانان، لە بەرامبەر بەجێهێنانى برِيارە شەرعييەكان و هەموو ئەو شتانەى پەيوەندييان بەم كاروبارانەوە هەيە.

ئەم بەرپرسيارييە مەترسيدارە كە لەسەر شانى خەڵكييە خوازيارى ئەوەيە كۆمەڵگا فەرمانرِەواييەك بۆ خۆيان هەڵبژێرن، تا بتوانن ئەوەى لە ئەستۆيان گرتووە و لە بەرامبەريدا بەرپرسيارن بيهێننە دى، كە لە راستيدا ئەويش بريتييە لە بەجێهێنانى برِيارە شەرعييەكانو بەرِێوەبردنى ئەو كاروبارانەى بەرامبەر بەم برِيارانەن.

لێرەدا لەبەرئەوەى بەكارهێنانى هێزو دەسەلآت بۆ هەموو ساتە تايبەتييەكان، لەلايەن هەموو تاكەكانەوە بەشێوەيەكى راستەوخۆ لە جێى خۆى نييە و كاركردنى لەو جۆرە ناگونجێ، دۆزى نوێنەرايەتى پيشاندراوە بۆ بەكارهێنانى دەسەلآت لەبەرامبەر ئەوەى لە ئەستۆى خەڵكيدايە، ئەوكاتە لەسەر چينەكانى خەڵك پێويستە كەسێك بۆ نوێنەرايەتى خۆيان هەڵبژێرن تا دەسەلآت بخەنە كار بۆ بەجێهێنانى ئەو شتانەى شەرع لەسەريانى پێويست كردووە، ئەم هەڵبژاردنى نوێنەرەش يەكێكە لە رەواترين مافەكانى خەڵك، چونكە خاوەندار مافى خۆيەتى كەسێكى تر بە نوێنەرايەتى هەڵبژێرێت بۆ خاوەندارێتى ئوممەتيش خاوەنى هێزو توانان، بۆيە بە هەمان شێوە مافى هەڵبژاردنى نوێنەريان هەيە، چونكە مافى هەڵبژاردنى سەرۆكى حكومەت تەنيا پەيوەندى بە خەڵكيەوە هەيە.

## جێگەى ياسايى سەرۆكى حكومەت

بە سەرنجدان لەوەى پێشتر باسكرا، جێگەى ياسايى سەرۆكى حكومەت روون دەبێتەوە كە بريتييە لە نوێنەرايەتى و بريكارى، واتە بريكار لە لايەن ئوممەتەوە، بەم پێيە سەرۆكى

حکومەت کەسێکە کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن خەڵکییەوە هەڵبژێرراوە تا کاروبارەکانیان لەسەر بنەمای یاسا ئیسلامیەکان بەڕێوە بباتو سەرجەمی بڕیارەکانی بەجێبهێنێ، یاساناسەکان ئەم بابەتەیان روون کردووەتەوە، لەوانە (ماوەردی) یاساناسی بەناوبانگ لەبارەی مردنی خەلیفە، یان وەزیر لەبەرامبەر فەرمانداریی ئەمیردا دەڵێت: هەر کاتێك ئەمیرێك پەیڕەوی لێبکرێتو لەلایەن خەلیفەوە دانرابێت، بە مردنی خەلیفە لەسەر کار لانابرێت، بەڵام ئەگەر ئەمیرێك لەلایەن وەزیرەوە دانرابێت ئەوا بە مردنی وەزیر ئەمیش لادەبرێت، چونکە دانان لەلایەن خەلیفەوە بە نوێنەرایەتی خەڵکە، بەڵام دانان لەلایەن وەزیرەوە بەرای خۆیەتی.(١)

## خەڵكی سەرچاوەی هێزو تواناكانن

لێرەدا کاتێك سەرۆکی حکومەت لە جێگەی نوێنەرایەتی دایە، ئاشکرایە تواناکانی خۆی لە نوێنەرگرەکەیەوە واتە خەڵکییەوە وەردەگرێت، بەم پێیە سەرچاوەی هێزو توانی خەڵکییە، وەك بە هەمان شێوە لە زاراوەی یاسایی ئەمڕۆدا روون دەکرێتەوە، سەرۆکی حکومەت بە پشتیوانی خەڵك و بە ناوی خەڵکییەوە لەم هێزو توانایە بەهرەمەند دەبێت.

هەڵبەتە پێویستە سەرنج لەم خاڵە بدرێت، ئوممەت گەرچی خاوەنی هێزو توانایە، بەڵام هێزەکەی سنووردارە، نەك رەها، واتە سنووردارە بە هێزو دەسەڵاتی خوای گەورە و ویستی ئەوەوە کە ئەویش لە سەرجەمی ئەو بڕیار و سیستمە کۆمەڵایەتیانەوە کە بۆ تاکەکان دانراون، روون بۆتەوە.

بەم پێیە مەبەست لە فەرمانڕەوایی ئوممەت بەجێهێنان و پیادەکردنی ئەو سیستمەیە، نەك دروستکردن و بەدی هێنانی.

بەهۆی ئەم تایبەتمەندییەوە کە لەم هێز و دەسەڵاتەدا هەیە فەرمانڕەوا مافی گۆڕینی ئەم سیستمەی نییەو ناتوانێت هێز و دەسەڵاتی لە کاروبارێکدا بەکاربهێنێت کە دژی ئەم

١) الاحكام السلطانية، ماوردي، ص٢٩.

ئاڕاستەیەیە، یان جەخت لەسەر گۆڕینی دەكاتەوە، وەك چۆن خەڵكیش مافی گۆڕینی یاسا و دەستووری خوا و بەكارهێنانی دەسەڵات و هێزیان لە دژی ئەو نییە، سەرۆكی حكومەتیش كە پلەی نوێنەری هەیە ـ بەهەمان شێوە خاوەنی ئەم مافە نییە، چونكە بریكار ناتوانێت لە پێش بە وەكیل گرەكەیەوە هێز و دەسەلاتی ئاڵوگۆڕكردنی هەبێت.

بەپێی ئەوانەی روونكرانەوە چەند خاڵێك ریزبەند بوون، لەوانە هەركاتێك ئوممەت دەستوورێك دابنێت كە گۆڕەری یاسای خوا بێت، یا شتێك پیادە بكات دژی یاسای خوا بێت، هەروەها ئەگەر سەرۆكی حكومەت ـ كە نوێنەری خەڵكییە ـ هەستێت بە كاری لەو شێوەیە ئەمە كارێكی بێ بەڵگەیە لە روانگەی شەرعەوە، بەهۆی دەرچوون و تێپەڕین لە سنووری هێز و دەسەڵات هەڵئەوەشێنرێتەوە پووچ دەكرێتەوە، چونكە وەك لە پێشدا باسكرا فەرمانڕەوای ئومەت فەرمانڕەوایەكی بەجێهێنەرە و یاسای پتەوی خوای گەورە بەجێ دەهێنێتو فەرمانڕەوایەكی دامەزرێنەر نییە تا شەریعەت و یاسایەكی تازە دابمەزرێنێتو پیادەی بكات.

### هەڵبژاردنی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ

خەڵكی خاوەنی مافی هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەتن، بەڵام بە چ شێوازێك ئەم كارە بەجێ بهێنن؟

ئایا سەرجەمی خەڵكی بۆ ئەنجامدانی ئەم كارە راستەوخۆ دەستبەكار بن، یان كۆمەڵێكیان بە نوێنەرایەتی هەموویانەوە ئەنجامی بدەن.

لە راستیدا تۆمارێكی روون و ئاشكرا بۆ چۆنێتی كاركردنی ئوممەت لە پێناو گەیشتنیان بە مافی خۆیان لە هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەتدا، لە شەریعەتدا نەهاتووە، جۆرێك لە دەرهێنانو هەڵگۆزین كە شێوە و چۆنیەتیەكەی لەسەر ئاستی مەرجە كاتی و شوێنییەكان (زمان ومكان) كە ئوممەت پیایدا دەڕۆن دەست نیشان دەكرێت، بەم پێیە ئەگونجێ بە دوو رەوشی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئەنجام بدرێت.

بە باوەڕی ئێمە چوارچێوە شەرعییەکان هەڵگری هەردوو شێوەکەن، لەبارەی هەڵبژاردنی راستەوخۆوە، ئەتوانرێ پشت بەم ئایەتە لە قورئاندا ببەسترێت، کە دەفەرموێت: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ (الشورى: ٣٨). رواڵەتی ئەم دەقە خوازیارە کە تاکەکانی ئوممەت لە کارەکانیاندا راوێژ بکەن، لەوانەیش هەڵبژاردنی سەرۆکی حکومەتە، هەمووان بۆ بەجێهێنانی ئەم مافە بەشداری دەکەن، مەگەر کەسێك بەهۆی بەهانەیەکی شەرعییەوە جیا بکرێتەوە وەك: منداڵ، شێت، ناموسڵمان.

ئەوەی کە پێشەوا (فەخری رازی) لە توێژینەوەی ئەم ئایەتەدا روونی کردووەتەوە پشتیوانی دیدگای ئێمەیە لە بەشداری کردنی ئومەت بۆ هەڵبژاردنی راستەوخۆ دەفەرموێت: (هەر کاتێك رووداوێك دروست دەبوو کۆدەبوونەوە و راوێژیان لەگەڵ یەکتر دەکرد و خوای گەورە لەو کارەدا ستایشی دەکردن، بە واتایەکی تر بە رای تاکڕەو کاریان نەدەکرد و لەسەر شتێکیش کە کۆنەبووبوونەوە بۆی زۆر و فشاریان بەکارنەدەهێنا).[1]

لە پێشینەی مێژوویی موسڵماناندا، لەسەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا چەند بەڵگەیەکمان بۆ هەڵبژاردنی ناراستەوخۆ لەلا گەڵاڵە دەبێت، لە کاتێکدا ئەو سەردەمانە لە روانگەی چەمكو واتا ئیسلامییەکانەوە و پیادەکردنیان، باشترین سەردەم بوون، ئەم خەلیفە مەزنانە لەلایەن کۆمەڵێك خەڵکەوە بۆ خیلافەت کردن هەڵبژێردران، هەر ئەوانیش بوون کە بە (ئەهلی حەلو عەقد) ناسراو بوون، ئەو خەڵکەیشی لە مەدینە بوون پەیڕەوییان لەوان دەکردو پەیمانیان بەکەسێك دەدا کە بۆ سەرۆکایەتی حکومەت هەڵبژێردرابوو، بۆیە بەو شێوەیە نەبوو کە هەڵبژاردنەکە تەواوی موسڵمانانی هەموو شوێن و سەرزەمینە ئیسلامیەکان بگرێتەوە، لە بەرامبەر ئەم جۆرە هەڵبژاردنەدا هیچ جۆرە نوکوڵیی و پێشنیارێك نە لەلایەن خەلیفەکانی راشدینەوەو نە لە لایەن غەیری ئەوانیشەوە نەهاتووە.

---

١) تفسير الرازي، ج٢٧، ص١٧٧.

بۆیە ئەتوانرێ ئەمە بە جۆرێك لە كۆدەنگی (اجماع) دابنرێت بۆ دروستی ئەم جۆرە هەڵبژاردنە (ناراستەوخۆ)، هەروەها بەڵگەو سەنەدێكیشمان لێیەوە دەست دەكەوێت بۆ راستیو دروستی مافی خەڵك لە هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەتدا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ.

لەبەرئەوە، تا ئەو كاتەی خەڵكی خاوەنی مافی هەڵبژاردن بن ئەتوانن بەشێوەی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بەشداری بكەن.

كاتێك كە بەشداری راستەوخۆ پێویست نەكات، خاوەن ماف دەتوانێت تێیدا وەكالەت بدات بە غەیری خۆی، یاساناسەكانیش هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆیان روونكردۆتەوە، چونكە باوەڕیان وایە (ئەهلی حەلو عەقد) سەرۆكی حكومەت هەڵدەبژێرن، پێویستی بە بەشداریی سەرجەمی خەڵكی نییە.

ئیبن خەلدون لە (**مقدمة**)دا دەڵێت: (هەركاتێك جێگیر بوو كە پلەی خیلافەت بە كۆدەنگی دەستنیشان دەكرێت، ئەوە فەرزی كیفایەیە و پەیوەندی بە سنووری هەڵبژاردن و پەسەندكردنی (ئەهلی حەلو عەقدەوە) هەیە تا كەسێك بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژێرن، ئەو كاتە فەرمانبەرداری لەسەر خەڵكی پێویست دەبێت).[(١)]

ماوەردی لەمبارەوە دەڵێت: (پێشەوایەتی، یان سەرۆكایەتی حكومەتی ئیسلامیی بە دوو جۆر و شێوە گرێ دەدرێت، یەكێكیان هەڵبژاردنە لەلایەن ئەهلی حەلو عەقدەوە، دووەمیان بەهۆی جێنشینكردنییەوە لەلایەن سەرۆكی پێشووەوە).[(٢)]

## دەستەی حەلو عەقد

ئەگەر رەوشی بەجێهێنانی هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت لە یاسای ئیسلامییدا لە رێگەی هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆوە بێت، ئەوا ئەو كەسانەی كە ئەو كارە جێبەجێ دەكەن لە زاراوەی یاساناسەكاندا بە ئەهلی حەلو عەقد ناودەبرێن.

١) مقدمە ابن خلدون، ص١٩٣.

٢) الماوردی، ص٤.

بۆیە پێویستە بزانین ئەهلی حەلو عەقد چ کەسانێکن؟ پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکیدا چۆنە و بەچی جۆرێك لەم پلە و پایە بەهرەمەند دەبن؟

لەبارەی پرسیاری یەکەمەوە: یاساناسەکان کۆمەڵێك تایبەتمەندی گشتییان بۆ ئەهلی حەلو عەقد داناوە، بۆ نموونە (ماوەردی) سێ تایبەتمەندی بۆ داناون:

**یەکەم:** دادپەروەری بەسەرجەمی مەرجەکانییەوە.

**دووەم:** زانستی تەواو بۆ ناسینی ئەو کەسەی کە شایەنی پێشەوایەتییەو خاوەنی مەرجی بەڵگە بەخش بێت.

**سێیەم:** زیرەکی و دانایی پێویست لە پێناو هەڵبژاردنی کەسێکدا کە بۆ پێشەوایەتی شایستەتر و بەپەرۆشتر بێت لە پێناو بەرژەوەندییەکاندا.[١]

کۆمەڵێك لە یاساناسە تازەکان بەنیازی روونکردنەوەیەکی زیاترن دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ئەهلی حەلو عەقد، لەوانەش (رەشید رەزا) خاوەنی (تەفسیری مەنار) کە دەفەرمویێت: (**اولی الأمر:** کۆمەڵێکن لە موسڵمانانی ئەهلی حەلو عەقد کە بریتین لە ئەمیرەکان، حاکمەکان، زاناکان، سەرانی سوپاو هەموو ئەو گەورە پیاوو کەسانەی کە خەڵکی لە پێناوی بەرژەوەندییە گشتییەکان و چارەسەرکردنی کێشەکانیاندا ئەگەڕێنەوە بۆ لایان).[٢]

لەم دەروازیەوە ئەتوانرێ ئەوەمان دەست بکەوێت ئەهلی حەلو عەقد ئەو کەسانەن کە خەڵکی گوێڕایەڵییان دەکەنو باوەڕیان پێیانەو هاوڕای راو بۆچوونەکانیانن، چونکە دڵسۆزی و دامەزراوی و لە خواترسی و دادپەروەری و دروست بیرکردنەوە و ناسینی کاروبارەکانو هەوڵ و کۆشش لە رووی بەرژەوەندییەکانی ئوممەتیان تیادا دەبینن.

لە بارەی پرسیاری دووەمەوە: وابەستەیی و پەیوەندی ئەهلی حەلو عەقد لەگەڵ خەڵکیدا لە جۆری نوێنەرایەتی و وەکالەتە، واتە بە نوێنەرایەتی ئوممەتەوە لە هەڵبژاردنی سەرۆکی

١) الماوردي، ص٣-٤.

٢) تفسير المنار، رشيد رضا.

حكومەتدا بەشداریی دەكەنو لە جێبەجێكردنی ئەو ئەركەدا وەكیلی ئوممەتنو هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت لەلایەن ئەوانەوە، بە واتای هەڵبژاردنی لەلایەن ئوممەتەوە دێتە ئەژمار.

لەبارەی پرسیاری سێیەمەوە: واتە چۆن ئەهلی حەلو عەقد لەكاروبارەكانی خەڵكیدا لەم زەمینەدا بەهرەمەند دەبن.

رەنگە وا بیر بكرێتەوە كە ئەوان لە ئەنجامی هەڵبژاردنیانەوە لە لایەن خەڵكییەوە دەگەنە ئەم پلەیە، بەڵام لە پێشینەی مێژوویيدا نەبینراوە خەڵكی كۆببنەوە و دەستیەك هەڵبژێرن و تایبەتمەندی ئەهلی حەلو عەقدیان پێ ببەخشن، لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونی ئەوەی كە لە پێشوودا باسمان كرد لە پێشینەی مێژوویيدا بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی كە ئەو كۆمەڵەی بە ناوی ئەهلی حەلو عەقدەوە ناسراو بوون، نوێنەری خەڵكی نەبوونو وەكیلییەكەیان لێوەرناگیرێت، چونكە بەستنی پەیمانی وەكالەت ـ كەوا بەناوبانگە ـ بەشێوەی ئاشكراو بەشێوەی نهێنیش (ضمنی) دەبەسترێت، وەك چۆن وەكیلایەتی ئەهلی حەلو عەقد لە سەردەمی خەلیفەكانی راشدیندا وەكیلایەتییەكی نهێنی (ضمنی) بووە.

چونكە ئەوان بە دڵسۆزو شیاوو كارزانو دادپەروەرو سەرەتایی لە ئیسلامدا (زووتر موسڵمان بوو بوون) ناسرا بوون، بەم پێیە ئەوان بەرازی بوونو باوەڕپێكردنیان لەلایەن خەڵكییەوە بەهرەمەند بوون، بۆیە پێویستی نەكردووە ئوممەت بەشێوەیەكی ئاشكرا هەڵیان بژێرێت، ئەگەر پرۆسەی هەڵبژاردنیش بەرگوزار ببوایە جگە لەوان كەسی تر تیایدا سەرنەدەكەوتو بەو جۆرە ئەگەر كەسێكیش بانگەشەی كێبەركێی بكردایە لەگەڵ ئەهلی حەلو عەقددا لە پێناوی پاراستنی ئەم پلەوپایەیەدا بەو ئیشی چاودێری و كێبەركێیە هەڵدەستا.

بۆیە هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت لەلایەن ئەوانەوە نوێنەرایەتی و وەكالەتێكی رەزامەندانە و نهێنیانە بووە لە روانگەی ئوممەتەوە.

## ناسراويەتى ئەهلى حەل و عەقد لەسەردەمى ئێستادا

ئەگەر بمانەوێت لەسەردەمی ئێستەدا هاوڕێك بە دەستورە شەرعیەكان بەشێوەی ناراستەوخۆ سەرۆكی حكومەت هەڵبژێررێت، خەڵكی ناچارن كەسانێك هەڵبژێرن تا نوێنەریان بن لە بەشداریكردنێكی راستەوخۆ لەم هەڵبژاردنەدا. ئەو كەسانەی كە بۆ ئەم ئەركە گرنگە هەڵئەبژێررێن، ئەتوانرێ بە ئەهلی حەلو عەقد ناوببرێن، چونكە بواری رەزامەندی خەڵكین و لە لایەن خەڵكییەوە ئەپارێریزرێن و لایەنگرییان لێدەكرێت.

ئەركی حكومەتە مەرجی پێویست بۆ بەرگوزاركردنی ئەم هەڵبژاردنە و گرنتی دانی سەلامەتیەكەی فەراهەم بكاتو بوونی مەرجی پێویستیش لەو تاكانەدا دەستنیشان بكات، كە لە لایەن خەڵكییەوە بە ناوی ئەهلی حەلو عەقدەوە هەڵدەبژێررێن.

لەبەر رۆشنایی ئەوەی یاساناسان باسیان كردووە ئەم جۆرە هەڵبژاردنە پێویست و زەروورییە لە پێناو پێكهێنانی ئەهلی حەلو عەقدداو جێگیر كردنی وەكالەتەكەیان بەشێوەیەكی روونو ئاشكرا، چونكە بەجێهێنانی وەكالەتی نهێنی لەسەردەمی ئێستەدا بە هۆی زۆری خەڵكەوە دژوارو سەختە.

ئەگەر هەركەسێك كە خاوەنی مەرجەكانی ئەهلی حەلو عەقد نەبێتو بەنوێنەریان بزانێت ئەوا دەرگایەكی سامناك لەسەر ئوممەت والا دەبێتو خراپی و ئاژاوەو پەشێوی هەموو لایەك دەگرێتەوە، وە ئەمەش شتێكە نە شەریعەت رێگەی پێ دەداتو نە عەقڵی تەواو پەسەندی دەكات.

### جێنشینی

كۆمەڵێك رەخنەیان لەوە گرتووە كە خەڵكی خۆیان سەرۆكی حكومەت هەڵدەبژێرن، چونكە زانایانی ئیسلامی وتوویانە سەرۆكایەتی حكومەت لە رێگەی بەخشینی لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە بە خەلیفەی پاش خۆی وێنا دەگرێت.

بۆ نموونە ماوەردی دەڵێت: (پێشەوایەتی (سەرۆکی جکومەت) بە دوو شێوە پێکدەهێنرێت، یەکەمیان: هەڵبژاردنی لەلایەن ئەهلی حەلو عەقدەوە. دووەمیان بەهۆی جێنشین کردنیەوە لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە).[١]

لە وەڵامدا پێویستە بوترێ تەفسیری یاسایی بۆ ئەو کەسە ئەوەیە کە ئەو لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە بۆ سەرپەرشتی کردنی حکومەت ناوی دراوە و کاندیدکراوە ئەمەش مانای دەستنیشانکردنی تەواوەتی ئەو ناگەیەنێت، چونکە ئەهلی حەلو عەقد پەیمانی پێ دەدەن، ئەگەر ئەم جێنیشینیکردنە بۆ سەرۆکایەتی کردنی حکومەت تەواوە، ئیتر چ پێویستی بە پەیماندانی ئەوان هەیە؟ ئەگەر لە کاتێکدا ئەهلی حەلو عەقد یا خەڵکی ئەو ناودراوە وەرنەگرن، هەرگیز ناتوانێت ببێتە سەرۆکی حکومەت، کۆمەڵێك لە یاساناسان ئەمەیان روونکردووەتەوە و دەڵێن: (سەرپەرشتیی حکومەت، لە رێگەی پەیماندانی خەڵکی بە سەرۆکی حکومەت جێگیر دەبێت، نەك بە هۆی جێنشینیکردنییەوە لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە).[٢]

## دووەم: مافی پرسو را

دووەمین ماف کە تاکەکان تیایدا بەهرەمەندن، مافی پرسو رایەو لە راستیشدا پاشکۆی هەمان مافە کە لە هەڵبژاردنی سەرۆکی حکومەتدا هەیانە، کەسێك کە بۆ سەرۆکایەتی هەڵدەبژرێرێت تا ئەو کاتەی لەو پلەو پایەدا دەمێنێـەوە پێیویستە پرسو را بە خەڵکی بکات، ئەمەش یەکێکە لە مافەکانیان لە سرجەمی ئەو کاروبارانەدا کە پەیوەندی پێیانەوە هەیە و ئەویش (سەرۆك) مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو شتانەی هەیە.

**بەرپەرچدانەوەو وەڵامی ئەمە:**

کۆمەڵێك لەسەر ئەم بابەتە رەخنەیان گرتووە، مادەم سەرۆکی حکومەت ئەو کەسە بێت کە خەڵکی خۆیان هەڵیانبژاردووە و بواری پشت پێبەستنیان بووە ئیتر مانای نییە کە پابەند بێت بە پرس و رای ئەوانەوە لە دوو لایەنەوە ئەتوانرێ وەڵامی ئەمە بدرێتەوە:

---

١) الماوردي، ص٤.

٢) منهاج السنة النبوية، ابن تيمية، ج١، ص١٤٢.

**لایەنی یەكەم:** سەرۆكی حكومەت هەرچەندە جێگەی باوەڕی خەڵكی بێتو لە لایەن ئەوانەوە هەڵبژێررێت پێدەچێ بە ئارەزوو یان بە سەهو دەست بداتە كارێك كە بە زەرەری ئوممەت بشكێتەوە و لە دوای ڕوودانی هیچ ڕێگەیەك نەبێت بۆ قەرەبووكردنەوەی ئەو زەرەرە، لەبەرئەوە ئوممەت مافی هەیە دەربارەی ئەوەی كە پەیوەندی پێیەوە هەیە پارێزگارانە كار بكاتو سەرۆكی حكومەتیش لە پێناو دوورخستنەوەی زەرەردا، پابەند بكات بە پرس و ڕاوە.

**لایەنی دووەم:** وەكالەتی سەرۆكی حكومەت لە ئوممەتدا وەكالەتێكی سنووردارە، یەكێك لەو قەیدانە ئەوەیە كە پرسو ڕا بە خەڵك بكات، چونكە لەبارەی پرس و ڕاوە دەقی شەرعی هاتووە و خەڵكی ناتوانن لێی دەربچن، چونكە وەك لە پێشترا باسكرا دەسەڵاتو تواناكانی خەڵكی سنوردار كراوە بە شەریعەتەوە و مافی پێدانی ئەوەش بە وەكیل (سەرۆكی حكومەت) پێویستە هاوڕێكی ئەو قەیدە بێت، جا چی لە كاتی هەڵبژاردنەكەدا ئەم قەیدە ڕوونكرابێتەوە یا نەكرابێتەوە.

دەقی شەرعی لەبارەی پرس و ڕا كردنەوە، ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە كە دەفەرموێت: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ (ال عمران: ١٥٩) واتە: چاوپۆشییان لێ بكەو لێیان ببورەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكە، لە كارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بكە، ئەگەر بڕیارتدا پشت بە خوا ببەستە.

لەم ئایەتەدا پێویستی پرسو ڕا لە بەرزترین پلەی حكومەتدا بە ئاشكرا ڕوون كراوەتەوە، چونكە ڕواڵەتی جۆری فرمانەكە بۆ پێویست بوونە مەگەر نیشانەیەك ببێتە بەربەست لە بەردەم ئەم دەلالەتەدا.[١]

وە ئەگەر خیتابی ئەم ئایەتە كە هەڵگری فەرمانكردنە بە پرس و ڕا ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ بێتەوە، كە لە كۆتایی گەورەیی بەرزیدایە، ئەوا پێویست بوونی پرس و ڕا بۆ غەیری ئەو لە دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی ئیسلامیی پێویست ترە.

---

١) الوجیز في اصول الفقه، پەرتوكێكی تری نووسەرە.

وتەی یاساناسان و توێژەرەوەکانیش بە هەمان شێوە ئەم خاڵە دوویات دەکەنەوە، لەوانە لە کتێبی (السياسة الشرعية)ی ئیبن تەیمیەدا هاتووە: (سەرۆکی حکومەت بێ نیاز نییە لە پرس و را کردن، چونکە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی پێ کردووە).[١]

لە تەفسیری (طبري)دا تەفسیری ئەم ئایەتە بەم شێوەیە هاتووە:

(بەراستی خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی کە لەو کاروبارانەدا پرس و را تیایاندا پێویستە لەگەڵ هاوەڵەکانی خۆیدا پرس و را بکات تا ئوممەتەکەی فێر ببێت لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی دژوارییدا پەیڕەوی پێغەمبەر بکەن و لە کارەکانیدا لەگەڵ یەکتر پرس را بکەن).[٢]

لە تەفسیری (رازی)دا بەم شێوەیە هاتووە:

(حەسەن و سوفیانی کوڕی عوەینە فەرموویانە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کراوە بە پرس و را کردن تا خەڵکیش بەهەمان شێوە لە پرس و را کردندا پەیڕەوی ئەو بکەن و لەناو ئوممەتەکەیدا ببێتە سوننەتێك).[٣]

## پرس و را کردن بە ئوممەت لە سوننەتە پایەدارەکانی پێغەمبەرە ﷺ

ئەوەی کە لە پێناوی ئوممەتدا، مافی پرس و را لەسەر فەرمانڕەوایان سەقامگیر دەکات لەوێدایە کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گەورەیی و سەروەری پلەو پایەیدا و بەهرەوەری لە سروشی خوایی، لە چەندەها بابەتی جیاوازدا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پرس و رای کردووە.

لە شەڕی ئوحود دا لەسەر ئەوەی ئایا لە مەدینەدا بمێننەوە یان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن بچنە دەرەوەی مەدینە پرس و رای لەگەڵ کردن.

لە شەڕی بەدر دا حەبابی کوڕی مونزیر بۆ پڕکردنەوەی بیرە ئاوییەکان پرس و رای لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد و بۆچوونەکانی پەسەند کرا.

---

١) السياسة الشرعية، ابن تيمية.

٢) تفسير الطبري، ج٤، ص٩٢. تفسير القرطبي، ج٤، ص٢٥٠.

٣) تفسير الرازي، ج٩، ص٦٦.

لەشەڕی خەندەق دا سەعدی كوڕی موعاز و سەعدی كوڕی عوبادە دەربارەی ڕێنەكەوتن لەگەڵ دوژمندا لە پێناو كشانەوەیان لەشەڕ لە بەرامبەر بەشێك لە داهاتی مەدینە، لەگەڵ پێغەمبەر دا ﷺ پرس و رایان كردو بۆچوونەكەیان پەسەند كرا.[١]

پێغەمبەر ﷺ بەم شێوە فراوانە لەگەڵ هاوەڵەكانیدا پرس و رای دەكرد تا ئەو جێگەیەی كە زانایان دەڵێن: (هیچ كەسێك زۆرتر لە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵەكانیدا پرسو رای نەكردووە).[٢]

## وازهێنان لە پرس و را هۆكاری لادانی سەرۆكی حكومەتە

بەسەرنجدان لە جێگربوونی مافی ئوممەت لە پرس و رادا و پابەندبوونی سەرۆكی حكومەت پێیەوە، یاساناسان روونیانكردۆتەوە كە وازهێنان لەم مافە لەلایەن سەرۆكی حكومەتەوە ئەبێتە هۆكاری لادانی لە پۆستی سەرۆكایەتی.

لە تەفسیری قورتوبی دا هاتووە: (ئیبن عەتیە ئەفەرموێت: شورا یەكێكە لە بنەماكانی شەرع و بڕیارە توندوتۆڵەكان، كەسێك پرس و را بە خاوەن دین و زانستەكان نەكات، دوورخستنەوە و لادانی پێویستە).[٣]

بەم پێیە سیستمێك كە لەسەر بنچینەی ئیسلام بونیاد بنرێت هیچ فەرمانڕەواییەكی خودڕەئو چەوسێنەرەوە تیایدا بەردەوام نابێت.

## پرسو را لە چی كاروبارێكدا وێنا دەگرێت

پرسو راكردن بە خەڵكی لە كاروبارە جیاوازەكانی حكومەتدا وێنا دەگرێت، هەروەك لەو كاروبارە ئیجتیهادیانەدا كە پەیوەستن بە شەرعەوە و هیچ دەقێك لەبارەیانەوە نەهاتووە.

بە وتەی یاساناسان سەرۆكی حكومەت لە كاروباری دینو دنیادا پێویستی بە پرسو را هەیە.

١) تفسير الرازي، ج٩، ص٦٧.

٢) السياسة الشرعية، ابن تيمية.

٣) تفسير القرطبي، ج٤، ص١٤٩.

لە تەفسیری (جصاص)دا هاتووە: (پرس‌و را لەو کاروبارە دینی‌و دنیاییانەدا وێنا دەکرێت کە لە بارەیانەوە هیچ دەقێکی وەحی بوونی نییە).[1]

پرس‌و را لە کاروبارە دنیاییەکاندا ئەتوانێ لە بارەی مەسەلەی گرنگی وەکو سیاسەتە گشتییەکانی حکومەت، لەشکرکێشی‌و بانگەشەی جەنگ، ئیمزای پەیماننامەکان و .. هتد دابێ، پرس‌و را لە مەسەلە جوزئی و بچووکەکاندا وێنا ناگرێت، چونکە کاری لەو شێوە نەگونجاو و ناپەسەندە و پێویست ناکات، هەروەها سودێکی وەهای تیادا نییە و هیچ بەڵگەیەکیش لە بارەی پرس و راکردنی دا نییە.

### ئەهلی شوورا

پرس و را چۆن ئەنجام دەدرێت؟ ئایا پێویستە سەرۆکی حکومەت لەگەڵ هەموو ئوممەتدا دانیشێت بۆ پرس و را، یان لەگەڵ کۆمەڵێکیاندا یا چەند تاکێك لەوان؟

ئەوەی لە رەوش و کارەکانی پێغەمبەردا ﷺ دەست دەکەوێت ئەوەیە کە ئەوان لەو کاروبارانەدا کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندیی بە هەموانەوە هەبووە پرس و رای لەگەڵ سەرجەمی موسڵماناندا کردووە.

وەك بەو شێوەی لە مەسەلەی چوونە دەرەوە لە شاری مەدینە بە مەبەستی جەنگ کردن لەگەڵ موشریکەکاندا لەشەڕی ئوحود بە ئەنجام گەیشت، کە بە سەرجەمی ئەو کەسانەی لە مەدینەدا بوون پرس و رای کرد و پێی فەرموون (**اشيروا علي**) واتە: بۆچوونی خۆتانم پیشان بدەن.

هەروەها لە مەسەلەی ئەو دەستکەوتانەی کە لە لاشەڕی هەوازندا دەستکەوتبوون پێغەمبەر ﷺ هەوڵیدا تاوەکو بۆچوونی سەرجەمی موسڵمانانی بەشداربوو دەربارەی ئەو غەنیمەیە کە تووشی هاتبوون تێیدا بزانێت.

---

1) احکام القرآن، جصاص، ج٢، ص٤٠.

ئەگێڕنەوە لە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نەخشەی خۆی دەربارەی غەنیمەکە پیشانی ئامادەبووان دا وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە هەموومان رازیین بەوەی تۆو تەسلیمی تۆین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**فموروا عرفائكم ان يرفعوا ذلك الينا حتى نعلم**) واتە: (بە سەردەستەکانتان بڵێن، ئەوەمان پێ بگەیەنن تا ئاگاداری راوبۆچوونتان بین،. بۆیە زەیدی کوڕی سابت بەرەو رووی ئەنصار رۆشت و پرسیاری لێکردن کە ئایا بە رای پێغەمبەر ﷺ رازیین؟ وەلامیان دایەوە کە ئەوان تەسلیمی بۆچوونەکەنو هەموویان پێی رازیین، هەتا یەك کەسیان پێچەوانە نەوەستا...".[١]

لەم رووداوەدا ئەهلی شوورا سەرجەمی ئەو موسڵمانانە بوون کە بابەتی پرس‌و را کە پەیوەند بوو پێیانەوە.

لە هەندێك بابەتیشدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵەکانیدا پرس و رای کردووە نەك هەموویان، وەك بابەتی ئەسیرەکانی جەنگی بەدر، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵەکانیدا پرس و رای کرد، دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ئەسیری و چی لەگەڵ کردنیانو سەربایی (فیدیە) یان لێ وەربگرێت یان نا؟

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سەعدی کوڕی موعاز و سەعدی کوڕی عوبادەدا پرس و راوێژی کرد دەربارەی مەسەلەی رێککەوتن لەگەڵ هۆزی (غەتەفان) لە بەرامبەر دەستکەوتی $\frac{١}{٣}$ ی داهاتی مەدینە کە لەو شەڕەدا بگەڕێنەوە و جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا نەکەن، ئەوان وتیان ئەگەر ئەمە فەرمانی خوای گەورەیە ئەنجامی بدە، ئەگەر ئیشێکیشە فەرمانت پێنەکراوە، (وە بیشزانە ئەگەر ئارەزووت هەیە ئەوا ئێمە گوێڕایەڵێت دەکەین)، وە ئەگەر تەنها پێشنیارێکە بە باوەڕی ئێمە شتێك جگە لە شمشێر لە بەرامبەری ئەواندا چارەسازتر نییە. پێغەمبەر ﷺ بۆچوونەکەی ئەوانی پەسەند کردو وازی لە رێککەوتنەکە هێنا.[٢]

---

١) امتاع الاسماع، ص٤٢٩.

٢) امتاع الاسماع، ص٢٣٦.

لەسەر پۆلێنكاری ئەو پێشینە مێژووییەی موسڵمانان، لە سیرە و رەوشتی پێغەمبەردا ﷺ جارێك شورا لە سەرجەمی تاكەكانی ئوممەت پێكهاتووە، وەك مەسەلەی (غەنیمەكەی هەوازن) جارێكیش شوورا لەسەرجەمی سەرۆك هۆزەكان پێكهاتووە وەك ئەوەی لە مەسەلەی (غەتەفان) دا ووریدا، چونكە سەعدی كوڕی موعاز و سەعدی عوبادە لە گەورە و سەركردەكانی پشتیوانان بوون.

لە هەندێ جاری تریشدا ئەهلی شوورا لە هەندێك موسڵمانان پێكدەهاتن، وەك مەسەلەی ئەسیرەكانی بەدر.

لەبەر رۆشنایی ئەم پێشینەیەدا، دەتوانرێ بوترێ ئەو كەسانەی كە لەگەڵ سەرۆكی حكومەتدا پرس و را دەكەن بە پێی جیاوازی بابەتی پرسو راكە لەگەڵ یەكتردا جیاوازییان هەیە، هەر كاتێك مەسەلەیەك لە كاروبارە گشتییە گرنگەكاندا بێت، كە پەیوەندی بە هەموانەوە هەیە لەسەر سەرۆكی حكومەت پێویستە بە پێی توانا لەگەڵ سەرجەمی ئوممەتدا پرسو را بكات، یان لەگەڵ ئەهلی حەل و عەقد دا كە نوێنەری ئوممەتن پرس و را بكات.

ئەگەر لە بارەیەكەوە بوو كە پێویستی بە جۆرێ لە ناسین و چاكتر بیرلێكردنەوە هەبوو پێویستە لەگەڵ كەسانی شارەزاو پسپۆڕانی ئەو بوارەدا پرس و را ئەنجام بدات.

قورتوبی لە تەفسیرەكەیدا ئاماژە بەم بارە دەكات (پێویستە سەرپەرشتیاران لەم بوارانەدا پرس و راوێژ لەگەڵ زانایاندا بكەن، لەوەی كە نایزانێ‌و لەو بوارە دونیایانەدا كە تیایدا رووبەڕووی كێشە دەبنەوە، لە رێكخستنی هێز و ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە جەنگەوە هەیە، لە كاروبارەكانی خەڵكیداو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندییەكانیانەوە هەیە، كاروباری وەزیرەكان و نووسەرەكان و كرێكارەكان و ئەو كاروبارانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندی و گەشەپیدان و ئاوەدانكردنەوەی وڵاتەوە هەیە)، تا ئەو جێگەی دەڵێت زانایان فەرموویانە: "ئەگەر دەربارەی بڕیارەكان (احكام) پرس و را ئەنجام بدرێت، پێویستە

راوێژكار (مستشار) لە تایبەتمەندی زانایی و دینداری بەهرەمەند بێت و ئەگەر دەربارەی ئیشە دنیاییەكان بوو، ئەوا پێویستە هۆشمەند (عاقڵ) و كارزان بێت".[١]

## رێكخستنی شوورا لە سەردەمی ئێستادا

لە بابەتەكانی پێشوودا پێشینەی موسڵمان و رەوش و سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ دەربارەی شوورا تاوتوێ كرد، لە كۆی ئەوانەدا ئەتوانرێ پەی بەوە بەرین كە شەریعەتی ئیسلام رێگەیەكی تایبەتیو سنووورداری بۆ شوورا دانەناوە كە ئەمەش لە راستی دا لە تایبەتمەندی ئایندە روانینەوە سەرچاوە دەگرێت، چونكە كارەكانی شوورا لەسەر كاتو شوێن جیاوازییان هەیە.

بەم پێیە رێكخستنی شوورا لە سەر زروف و حاڵی خەڵكی بنیات نراوە، كە ئەم شێوەش بۆ شوورا جۆرێك لە پایەداری دروست ئەكات.

لەسەر ئەم بنچینەیە، لە مەرجەكانی ئەم سەردەمەشدا خەڵكی پێویستە ئەهلی شوورا هەڵبژێرن، واتە كۆمەڵە كەسێك كە سەرۆكی حكومەت لە مەسەلە گشتییەكاندا راوێژیان پێ بكات، هەروەها لە كاتی چۆڵێتی پلەی سەرۆكی حكومەتدا، بتوانن بۆ ئەو جێگەیە (پلەیە) كەسێك هەڵبژێرن و لە بوارە پسپۆڕییەكاندا بەهرەمەند بن لە پرس و راكردن لەگەڵ سەرۆكی حكومەتدا چی لە ئەهلی شوورای هەڵبژێرراو بن یان نەبن.

لە مەسەلە گرنگەكاندا پێویستە بۆچوونی خەڵكی تیایاندا رۆڵی هەبێت، لە پێناوی ئەم مەسەلانە و مەسەلەكانی تریشدا، نەخشەیەك پێشنیاز بكرێت لە وانە ئەو بوارانەی مەسەلەی شوورا پەیوەندی پێیانەوە دەبێت، وەك چۆنێتی هەڵبژاردنی مەجلیسی شووراو شایستەیی، لەبەر رۆشنایی چوارچێوە گشتییەكانی شەریعەتدا.

لە پێناو دەستنیشانكردنی سەلامەتی هەڵبژاردنەكانی مەجلیسی شوورا و هەڵبژاردنی تاكی شایستە و دڵسۆز بۆ ئەندام بوونی تیایدا، تەنیا دانانی نەخشە بەس نییە، بەڵكو پێویستە

---

١) تفسير القرطبي، ج٤، ص٢٤٩ـ ٢٥٠.

لە رێی روونكردنەوە و بڵاوكردنەوەی چەمكە ئیسلامییەكانەوە هەوڵ بدرێت تا ئاستی رەفتاری خەڵكی بەرز ببێتەوە و تاكەكان لە سایەی تەقواو ترسان لە خوای گەورەدا بە جۆرێك پەروەردە بكرێن كە تاكی شایستە نەبێت هەڵی نەبژێرن، وە ئەو تاكەی لە لایەن ئوممەتەوە هەڵبژێراوە، بەو شێوەیەی كە ئیسلام فەرمانی كردووە هەستێت بە ئەنجامدانی ئەركەكانی.

## جیاوازی لە نێوان سەرۆكی حكومەت و مەجلیسی شووڕادا

كاتێك سەرۆكی حكومەت لەگەڵ مەجلیسی شووڕادا دووچاری جیاوازی بوون، لەم كاتەدا رێگە چارە چییە؟

رێگا چارە ئەوەیە كە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێ كراوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾ (**النساء: ٥٩**) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواكانتان بكەن كە لە خودی خۆتانن، ئەگەر لە شتێكدا بوو بە كێشەتان دەربارەی حوكمی خوایی ئەوە ئەو كێشەیە بگەڕێننەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی (قورئانو سوننەت)، ئەگەر باوەڕتان بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە كە ئەو شێوەیە چاكترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری كێشەكانتان). بە پێی ئەمە ئەوانەی كێشەیان تووش بووە ئەگەڕێنەوە بۆ لای كیتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ".[1]

لەسەر ئەم بەڵگەیە توێژەرەوان دەڵێن: (هەر كاتێك بڕیارێك (حكم) بە شێوەیەكی روون و ئاشكرا لە قورئاندا یا لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دەستكەوت پەیڕەوی كردنی پێویستە و پەیڕەوی كردن لە كەسێك كە پێچەوانەی ئەوەیە، ناڕەوایە).

ئەگەر بە شێوەیەكی روون حوكمێك دەست نەكەوت، ئەوا پێویستە بە جۆرێك كار بكرێت كە نزیكتر و لێچووتر بێت بە قورئان و سوننەت.[2]

---

١) تفسير الطبري، ج٥، ص٨٧. تفسير القرطبي، ج٥، ص٢٦١. أحكام القرآن، جصاص، ج٢، ص٢١٢.

٢) السياسة الشرعية، ابن تيمية، ص١٧٠.

بەڵام ئەگەر روون نەبێتەوە کە کام شێوە نزیکتر و لێچووترە لە قورئان و سوننەتەوە، ئەو کاتە رێگاچارە چییە؟

**لەو کاتە سێ رێگا چارە پیشان دەدرێت:**

## رێگا چارەی یەکەم: رێگەی دادوەری

ئەم شێوەیە پابەندی هەڵبژاردنی دەستەیەکی تایبەتە لە یاساناسان و خاوەن بۆچوون و شارەزاکان لە کاروبارە حکومەتییەکاندا لەگەڵ گرنتی دانێکی تەواوی سەربەستی دا لە کاروبارەکاندا بەبێ هیچ کاریگەریی جێهێشتنێك لەسەر بۆچوونەکانیان.

ئەم دەستەیە لێکۆڵینەوەو بە دواداچوون لەو جیاوازییە دەکەن کە کەوتۆتە نێوان سەرۆکی حکومەت و مەجلیسی شوراوە و پێویستە ئەم بۆچوونە پەسەند بکرێ و وەربگیرێ.

لەمبارەوە ئەوەی لە ئیمامی عومەرەوە ﵁ لە کاتی رۆشتنی دا بەرەو شام گێڕراوەتەوە، روونکەرەوەی ئەم رێگا چارەیەیە.

لە رێگادا پێیان راگەیەنرا کە وبا **(طاعون)** لە شامدا بلاوبۆتەوە، لەبەرئەوە لەگەڵ ئەو کۆچکردووانەی کە لەگەڵیان بوون دەربارەی رۆشتن یان گەڕانەوە پرس و راوێژی ئەنجام دا، بەڵام ئەوان جیاوازییان تێکەوت.

پاشان لەگەڵ یاریدەدەرانیشدا کە لەگەڵیا بوون پرس و رای کرد ئەوانیش بوون بە دوو بەشەوە.

لەم کاتەدا پرس و رای لەگەڵ ئەو پیاوە بە تەمەنە قورەیشیانەدا کرد کە لە کۆچکردووە سەرەتاییەکان بوون، ئەوان بە گەڕانەوە رایان داو پێشەوا عومەریش بۆچوونەکەیانی پەسەند کردو گەڕانەوە بۆ مەدینە.(١)

## رێگاچارەی دووەم: پەسەندکردنی رای زۆرینە

خواستی ئەم رێگاچارەیە ئەوەی کە سەرۆکی حکومەت بەرای زۆرینە کار بکات هەرچەندە پێچەوانەی بۆچوونی خۆیشی بێت.

---

١) تفسير المنار، ج٥، ص١٩٦ـ ١٩٧.

بۆ پشتگیری کردنی ئەم بۆچوونە ئەتوانرێ ئاماژە بەم خاڵە بکرێت کە پێغەمبەر ﷺ لە مەسەلەی هاتنە دەرەوەی بۆ رووبەڕووبوونەوەی موشریکەکان لە جەنگی ئوحوددا رای زۆرینەی پەسەند کرد، لە کاتێکدا خۆی ئارەزووی مانەوەی دەکرد لە مەدینەدا.[١]

لەبەرئەمە زۆرینە ترازووی پێودانگی راستیو پێکانە، گەرچی ئەمەش بەڵگەیەکی جیاکەرەوەو یەك لاکەرەوە نییە لەسەر دروستی رەئی زۆرینە، لەوانەیە زۆرینە لە هەڵەدا بن و کەمینە لە دروستی و پێکان دا بن.

**رێگاچارەی سێهەم: پەسەندکردنی رای سەرۆکی حکومەت بە شێوەیەکی رەها**

خواستی ئەم رێگەیە پێویستی دەکات کە سەرۆکی حکومەت لە دوای راوێژکردن لەگەڵ ئەهلی شووړادا، بەبێ خۆبەستنەوە بە رەئی زۆرینە یان کەمینەوە بە هەر جۆرێك کە خۆی بە چاکی بزانێت دەست بەکار بێت.

زانایان لە تەفسیرکردنی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ﴾ (**ال عمران**: ١٥٩). واتە: لە کارو پێشهاتدا پرسو راوێژیان پێ بکە، ئەگەر بڕیارت دا پشت بە خوا ببەستە. هۆگرترمان دەکەن بەم رێگا چارەیەوە.

قەتادە دەفەرموێت: (خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە کە هەر کاتێك لەسەر کارێك یەکلا بووەوەو بڕیاری دا کە ئەنجامی بدات پشت بە خوا ببەستێت نەك بە راوێژکارانی).[٢]

لێرەدا کە سەرۆکی حکومەت بەرپرسیارە لە بەرامبەر کارەکانیداو لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، پێویست دەکات دەربارەی ئەو مەسەلانە کە مادەم کاروبارێکی ئیجتهادین و پێچەوانەی هیچ دەقێکی یەکلاکەرەوەی شەرعیی نین ئازادی کارکردنی پێبدرێت.

ئەم بابەتە رێگاچارەی سێیەم بەهێز دەکات، دیارە کە بەرپرسیاربوونی مرۆڤ لە بەرامبەر کردەوەکانیدا پابەندە بەوەوە کە بە ئارەزوو و بۆچوونی خۆی ئەوە ئەنجام بدات، نەوەك بە

---

١) سيرة إبن هيشام، ج٢، ص٦.

٢) تفسير القرطبي.

بۆچوونی غەیری خۆی ئەنجامی بداتو پەیڕەوی كردنی بۆچوونی غەیری خۆی لەسەر پێویست بێت، چونكە ناتوانێت یەكێك پابەند بكرێت بە بۆچوونی غەیری خۆیو هەر لەسەر ئەم بۆچوونەش لێپرسینەوەی لەگەڵ بكرێت.

## ئەو رێگاچارەیەی كە ئێمە هەڵیدەبژێرین

دیدگای سێیەم لە رووی سەرنجی بینینەوە توندوتۆڵ و دامەزراوە، بەڵام بە هۆی سەرنجدان لە پێویستییە زەمانییەكان وەك گۆڕانكارییە رۆحییەكان، كاڵبوونەوەی دین، لاوازی ئیمانو كەمبوونەوەی پەروەردەبوانێك كە سەرمەشق بن، ناچارین كە بۆچوونی دووەم هەڵبژێرینو سەرۆكی حكومەت بە چەند مەرجێك پابەند بكەین، بە بۆچوونی زۆرینەوە:

یەكەم: هەر كاتێك سەرۆكی حكومەت بە رای زۆرینە نارازی بوو جیاوازییەكە جێدەهێڵرێت بۆ دەستەی بڕیاردەر.

دووەم: ئەگەر بۆچوونی دەستەی بڕیاردەریش نەیتوانی رازی بكات، ئەوا پێویستە بابەتی جیاوازیەكە بخرێتە بواری پرسكردنی گشتییەوە، ئەگەر خەڵكی پشتگیری بۆچوونەكەی سەرۆكی حكومەتیان كرد ئەوا بۆچوونەكەی پەسەند دەكرێت، خۆئەگەر پشتیگریان نەكرد ئەوا پێویستە بۆچوونی خەڵكی پەسەند بكات.

سێیەم: بەهرەمەندی لە ئازادی كاركردندا لەو شتانەدا كە خۆیان لە مەرجەكانی جیاكردنەوەدا دەبیننەوە وەك حاڵەتی جەنگ، یان دروست بوونی مەترسییەكی گەورە كە هەڕەشە لە سەلامەتی وڵاتەكە بكات، بەبێ ئەوەی ببەسترێتەوە بە هیچ بۆچوونێكەوە، جگە لەوەی كە خۆی بە باشتری دەزانێت.

**سێیەم: مافی چاودێری كردنو ئەو شتانەی لەسەری ریز بەندن**

خەڵكیو هەموو تاكێك مافی چاودێری كردنیان هەیە لەسەر سەرۆكی حكومەتو سەرجەمی والییەكانی لەو ئیشو هەڵسوكەوتانەدا كە پەیوەندییان بە كاروبارە حكومەتییەكانەوە هەیە.

ئەم كارە لە سروشتی پەیوەندی خەڵكی بە سەرۆكی حكومەتەوە سەرچاوە دەگرێت، كە پەیوەندی وەكالەتە و سەرۆكی حكومەتیش ئەو كەسەیە كە خۆیان هەڵیانبژاردووە، یەكێكیش لە مافەكانی وەكیلگر (موكل) چاودێری كردنی وەكیلە تا دڵنیابێت لە دروستی و تەواوی بەجێهێنانی ئەو شتانەی بە وەكالەت پێی دراوە.

ئامانج لە مافی چاودێری كردندا ئەوەیە كە هەر كاتێك سەرۆكی حكومەت لە حكومكردندا لە رەوش و رێگەی راست ـ رێگەی ئیسلام ـ لای دا، بگەڕێنرێتەوە بۆ سەر رێگەی راست، لە فەرموودەیەكی پیرۆزدا كە ئیمامی موسلیم لە صەحیحی خۆیدا ریوایەتی كردووە هاتووە **(أن النبـي ﷺ قال: الدين النصيحة، قلنا لمن؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)**. واتە: دین ئامۆژگارییە، وتمان لە پێناوی كێدا؟ فەرمووی: لە پێناوی خوادا (پیادەكردنی مافی پەرستن و بڕیارنەدانی هاوەڵ بۆی) و كتێبەكەیدا (لە بواری كار پێكردنیدا) و پێغەمبەرەكەیدا (پەیڕەوی كردنی سوننەت و رەوشتەكانیدا) و پێشەوایانی موسڵماناندا (لە فەرمانكردندا بەو شتانەی كە خوای گەورە ناردونی) و سەرجەم موسڵماناندا (بە بەجێهێنانی فەرمانەكانی خوا).

ئەگەر پەند و ئامۆژگاری سودی نەبوو، ئوممەت مافی بەكارهێنانی هێز و دەسەڵاتی پێویستیان هەیە بۆ رێككردنەوە و گەڕاندنەوەی سەرۆكی حكومەت لە ستەم و لادان و هەموو لاری و ناڕێكییەك.

ریوایەت كراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە دەفەرموێت: **(والله لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر ولتأخذن على يد الظالم ولتاطرونه على الحق اطرأ ولتقصرنه على الحق قصرا، أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض ثم ليعلننكم كما لعنهم)**.[1] واتە: سوێند بە خوا یا ئەوەتا فەرمان بە چاكە دەكەن و قەدەغەی خراپە دەكەنو دەستی ستەمكار دەگرنو دەیهێننەوە سەر رێگای راستو لەسەر راستی دای دەمەزرێنن، یان خوا

١) ئەبو داود ریوایەتی كردووە، (ریاض الصالحين) ص١١٢.

هەندێكیان لە هەندێكتان دڵگیر دەكات (جیاوازی دەخاتە نێوانتانەوە) و پاشان نەفرینتان لێدەكات وەك چۆن نەفرینی لە گەلانی پێشوو كرد.

لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: (**إن الناس إذا رأو الظالم فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمهم الله تعالى بعقاب منه**).[1] واتە: ئەگەر خەڵكیی ستەمكاریان بینیو بەریان لێ نەگرت، نزیكە خوای گەورە هەموویان بەسزای خۆی بگرێت.

## فەرمانڕەوایانی موسڵمانان خەڵكی بانگهێشت دەكەن بۆ چاودێری لەسەر كاروبارەكانیان

مافی چاودێری كرنی سەرۆكی حكومەتو كارمەندانو سەرجەمی والیەكان لەلایەن ئوممەتەوە، بە چاكترین شێوە لە دەوری سەرەتای ئیسلامدا پارێزراوە.

سەرباری ئەمەش سەركردەكانی حكومەتی ئیسلامیی ئوممەتیان بانگهێشت دەكرد بۆ چاودێری كرنی كارەكانیانو بە ڕێگەی ڕاست هێنانەوەیان لە كاتو هەنگاوی لاداندا پێشینەی زیندووی مێژوویی ئەو كارە شایستەی تۆمار كردووە بۆمان لەوانە ئەوەی كە ئەبوبەكری صدیق لە وتارەكەیدا فەرمووی: (ئەگەر بە دروستیو ڕاستی كارم كرد یارمەتیم بدەن، ئەگەر دووچاری هەڵخلیسكان و ناڕەوایی بووم بمخەنەوە سەر ڕێگای ڕاست).[2]

هەروەها لە وتارەكەی عومەری كوڕی خەتتابدا هاتووە: (هەركەسێك لە ئێوە خوارو خێچیەكی لە مندا بینی بمخاتەوە سەر ڕێگای ڕاست، یەكێك لە ئامادەبوان وتی: سوێند بە خوا ئەگەر تۆ لە خوارو‌خێچی دا ببینم بە شمشێر ڕاستت دەكەمەوە، لەم كاتەدا پێشەوا عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ خوا كە لە ئوممەتی پێغەمبەردا ﷺ كەسێك بڕیاری داوە بە شمشێرەكەی عومەری كوڕی خەتتاب ڕاست بكاتەوە).

---

١) رياض الصاحين، ص١١٣

٢) الطبقات الكبرى، ابن سعد، ص١٨٣.

## چوارەم: مافی لابرن (عزل)

### مافی خەڵكی لە لابردنی سەرۆكی حكومەتدا

وەك لە پێشتردا باسمان كرد سەرۆكی حكومەت ڕێژە بە خەڵكی لە جێگای وەكالەتدا سەقامگیرە، لەم شێوەشدا بەدیهیە كە سەربەستە لە سنووری وەكالەتەكەی بچێتە دەرەوە، یاخود بە هۆی ناتوانایی‌و ڕێك‌و تەواو ئەنجام نەدانی ئەركەكانی وەكالەتەوە، ئوممەت دەتوانێت لە كاری بخات‌و دووری بخاتەوە، چونكە ئەگەر كەسێك بەهرەمەند بێت لە مافی هەڵبژاردن، مافی لادانیشی هەیە، خەڵكی هەڵیانبژاردووەو مافی لابردنیشیان هەیە.

پێویستی بەكارهێنانی ئەم مافە، بوونی چەندان بەڵگەی پەسەند كراوی شەرعییە، لەوانە چوونە دەرەوە لە چوارچێوەی ئەركەكانی وەكالەت، یاخود ناتوانایی لە بەرامبەر ئەنجامدانی ئەركەكانی وەكالەتدا.

یاساناسانیش ئەم خاڵەیان ڕوونكردوەتەوە، لەوانە (ئوممەت دەتوانێت لە كاتی بوونی فاكتەرێكدا كە پێویستی لادان بێت پێشەوا لە پلەی خۆی بەركەنار بكات.

وەك ئەگەر شتێكی لێ بینرا هۆكاری بێ هێزكردنی بارو گوزەرانی موسڵمانانو لاوازكاری كاروبارە دینییەكان بێت، وەك چۆن لەپێناو بەهێزكردنو بەرزكردنەوەی دیندا خاوەنی مافی جێگیركردنی پێشەواو دامەزراندنی حكومەتن).[1]

یاساناسی بەناوبانگ (ئیبن حەزمی ئەندەلوسی) لەبارەی ئیمامەوە ـ سەرۆكی حكومەت ـ ەوە دەڵێت: (هەر كات پێشەوا لە ڕێی قورئانو سوننەتەوە پێشەوایی ئێمە بكات، فەرمانبەرداری كردنی پێویستە، بەڵام ئەگەر كاتێك لەو دوانە لابدات پێشی لێ دەگیرێ و دووچاری لێ پرسینەوەو تۆڵە لێ سەندنەوە دەبێت، وە ئەگەر جگە لە لابردنی ڕێگاچارەیەكی تر نەبوو بۆ ڕزگاربوون لە نارەوایی و خراپییەكانی، ئەوا دوور دەخرێتەوەو كەسێكی تر بۆ پێشەوایەتی هەڵدەبژێردرێت).[2]

---

١) (المواقف) ایجي (النظریات السیاسیة الاسلامیة) استاذ ضیاء الدین، ص٢٧٠.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٠.

## جۆرەکانی لابردن

ئومەت خاوەنی مافی لادانی سەرۆکی حکومەتەو ئەشتوانێت ئەو کارە لە ڕێی نوێنەرەکانییەوە کە بریتین لە ئەهلی حەلو عەقد بە ئەنجام بگەیەنێت، چونکە ئەوان لەم زەمینەیەدا بواری پشت پێبەستنی ئومەتن‌و فەرمانی لە کارخستنەکە لەوێوە دەردەچێت، لەوانەیە سەرۆکی حکومەت گرنگی بۆ ئەم فەرمانە دا نەنێت و وەلامی نەداتەوە، لەم جۆرە کاتەدا ئومەت لە پێناو دوورخستنەوەو لادانی دا دەتوانێت سود لە هێزو دەسەلات وەربگرێت، لە ڕاستیدا ئەمەش لە کاتێکدایە کە لەو پێناوەدا بەلگەیەکی پەسەند کراوی شەرعی بوونی هەبێت بۆ نموونە هەر کاتێك لە بنەمای ئیسلام‌و بڕیارە شەرعیەکان بچێتە دەرەوە کە لە دیدگای ئیسلامدا بە کوفر لە قەلەم بدرێت.

لە فەرموودەیەکی صەحیح دا کە عوبادەی کوڕی صامیت دەیگێڕێتەوە هاتووە **(دعانا النبـي ﷺ فبايعناه على السمع والطاعة في منشطنا ومكرهنا وعسرنا ويسرنا واثرة علينا وان لا تنازعوا الامر أهله إلا أن تروا كفراً بواحاً عندكم من الله فيه برهان).**[١]

واتە: پێغەمبەر ﷺ بانگی کردین بەیعەتمان لەگەڵ کرد لەسەر گوێڕایەڵی‌و فەرمانداری لە خۆشی‌و ناخۆشی‌و سەختی‌و ئاسانی، ڕای سپاردین بەسەرمانا کە شەڕ و ئاژاوە لەگەڵ خاوەن دەسەلاتدا مەکەن مەگەر کوفرێکی ئاشکرای لێ ببینن کە لەوبارەوە بەلگەیەکتان پێ بێت بۆ لای خوای گەورە).

بەلام مەرجی پەیوەندی کردن بەهێزەوە بۆ فەراهەمکردنی وزەی پێویست‌و زیادکردنی ئەگەری سەرکەوتنە، بۆ غەیری ئەم جۆرو شێوازە، بەکارهێنانی هێز ڕەوا نییە، چونکە لە بنەماکانی فەرمانکردن بە چاکەو قەدەغەی خراپە ئەوەیە کە هەستان بۆ بەرگری کردن لە خراپەیەك نەبێتە هۆکاری دروستبوونی خراپەیەکی گەورەتر، بێگومان لە فەراهەمکردن‌و بەدەستهێنانی هێزی پێویست لە پێناو لابردنی سەرۆکی حکومەت لە پلەو پایەکەیدا و ئاشکراکردنی کودەتایەکی چەکدارانە لە دژی ـ بەو جۆرەی یاساناسان باسیان لێوە کردووە ـ

---

٢) البخاري، ج٩، ص٨٥.

سەرئەنجامەکەی جگە لە خوێن ڕشتنو وێران بوونی شارەکان و لاوازبوونی حکومەت زیاتر نابێت، کە هەموو ئەم کارانە لە نموونەی خراپەن و هێنانە کایەی هۆکارەکانیان نارەوان.

## پێنجەم: مافی کاندیدبوون (مرشح)

## مافی تاك لە خۆکاندید کردندا

مەبەست لە کاندید بوون ئەوەیە کە تاك بۆ دەست پێشخەری کردن لە پلەیەکی حکومەتدا یان بۆ لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتییەکی گشتی خۆی کاندید بکات.

## ئایا لە حکومەتی ئیسلامیدا ئەم مافە بوونی هەیە بۆ تاك؟

بە پێی بنەمای دەستوورێکی گشتی ئەم مافە نییە، وەك چۆن لە فەرموودەیەکی صەحیح دا لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: **(یا عبدالرحمن بن سمرة لا تسأل الإمارة فان اعطتها عن مسألة وكلت اليها، وان اعطتها عن غير مسألة اعنت عليها).**[1] واتە: ئەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمرەوە داوای ئەمیری مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داخوازیەکەت پێت بەخشرا، بەرپرسیار دەبیت لەسەری، بەڵام ئەگەر بێ داواکردن پێت بەخشرا ئەوا یارمەتی دراوی (یارمەتی دەدرێیت لەلایەن خواوە).

بەم پێیە خۆپاڵاوتن هەڵگری داوای پلەو لێپرسراوێتییەو ڕەوا نییە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ غەیری خۆی کاندید بکات ڕەوایە، چونکە ئەمەیان هەڵگری داواکردنی ئەمیریو لێپرسراوی نییە، بەڵکو هەڵگری بانگەشەی ئوممەتە بۆ هەڵبژاردنی کاندیدی شایستەو ئەم جۆرە بانگهێشتە ڕەواو پەسەند کراوە.

## حوکمی خۆپاڵاوتن لەسەردەمی ئێستادا

هەرچەندە بە پێی بنەمای دەستوورێکی گشتی دروست نییە کە تاك خۆی بپاڵێوێ، بەڵام هەرکاتێك بەرژەوەندییەك یان پێویستییەك داخوازی هاتنە دی ئەوە بکات، دروستە.

---

١) البخاري، ج٩، ص١١٤.

بێگومان لەسەردەمی ئێمەدا کارەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووەو فراوانو بلاوبوونەتەوە، لەوانە ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بە ناسینو هەڵبژاردنی تاکی چاکترو شایستەترەوە هەیە.

لێرەدا لەبەرئەوەی سەرپەرشتی کردنی ئەو پلە حکومەتیانە لە پێناو بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بە پێی شەریعەت گرنگییەکی زۆری هەیە، کەسێك کە خۆی لەژێر ناوی شایستەتردا کاندید دەکات ئەم ئیشەی بە جۆرێك لە رێنماییو رابەریکردن بەرەو چاکە دەژمێردرێ و یارمەتیدانی هەڵبژاردنی چاکترو بەدیهێنانی ئەم داخوازییە گرنگەیە، لەبەرئەوە دروست و رەوایە.

ئەوەی لە (یوسف)ەوە (علیه السلام) هاتووە لە قورئاندا هۆگرترمان دەکات بەم بۆچوونە: ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ (**یوسف**: ٥٥). واتە: یوسف وتی بمکە بە لێپرسراوی گەنجینەی ئەم سەرزەمینە، چونکە بە راستی من پارێزەرێکی زانام).

گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەر یوسف ئەم پلەو پایەیەی لە پێناو خۆشەویستی ئەو جێگەیەدا داوانەکردووە، بەڵکو ئەوەی داواکرد تا ببێتە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵە ئامانجێك کە مایەی رەزامەندی خوای گەورەیە.

## پڕوپاگەندە کردن لە لایەن کاندیدەکانەوە

لێرەدا لەبەرئەوەی بە هۆی پێویستییەوە لە سەردەمی ئێستەدا خۆپالاوتن بە رەوا دانراوە، دروست نییە بۆ ئەو کەسەی کە خۆی کاندید کردووە هەستێت بە کاری پڕوپاگەندە و تیایدا وەسفو ستایشی خۆی بکاتو رەخنە لە بەرامبەرەکانی بگرێ، پالێوراوەکان دەتوانن خۆیان بناسێنن، ئەو بیرۆکەو بنەمایانەی لە کارەکانیاندا پەیڕەویان لێ دەکەن بۆ ئەو کەسانە روون بکەنەوە کە هەڵیان دەبژێرن، بێ ئەوەی هیچی بۆ زیاد بکەن.

## شەشەم: سەرپەرشتی كاروبارە گشتییەكان

### سەرپەرشتی كاروبارە گشتییەكان داخوازییەكە نەوەك مافێك:

بە بۆچوونی ئێمە سەرپەرشتی كاروبارە گشتییەكان لە شەریعەتی ئیسلامدا یەكێك نییە لە مافەكانی تاك، بەڵكو لە حوكمی داخوازییەكدایە (تكليف) لە لایەن حكومەتەوە بە سەر تاكەكاندا، وەك بەم شێوەی كە لەم فەرمووده پیرۆزەدا هاتووە كە ئەبوموسای ئەشعەری ریوایەتی كردووە (**دخلت على النبـي ﷺ انا ورجلان من بني عمي، فقال احدهما: يارسول الله أمرنا على بعض ما ولاك الله تعالى، وقال الآخر مثل ذلك، فقال: انا والله لا نولي هذا العمل احدا ساله او احدا حرص عليه**).[1] واتە: منو دوو ئامۆزام چووینە لای پێغەمبەر ﷺ یەكێكیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێك لەوانەی كە خوای گەورە پێیداوی بخەرە ژێر دەستمانەوە، دووەمیشیان بەهەمان شێوەی وت: ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا ئەو كارە نادەم بە كەسێك داخوازی بكات، یان كەسێك بە تەمای بێتو سوور بێت لەسەری.

### تاكەكان بەچی جۆرێك ئەركە حكومەتییەكان لە ئەستۆ دەگرن

لە كاتێكدا لە روانگەی شەریعەتەوە داواكردنی لە ئەستۆگرتنی كاروبارە گشتییەكان ناڕەواو نادروست بێت، بەخشینی ئەركە حكومەتییەكان بەتاكەكان بەچی جۆرێك دەبێت؟

لێرەدایە كە ئەركی سەرۆكی حكومەتو سەرجەمی كاربەدەستەكانی روون دەبێتەوە و لەسەریان پێویستە لە كاروبارە حكومەتییەكاندا چاكترو شایستەتر دابنێن، ناڕەوایە بە هەندێ بیانوی وەك خزمایەتی و دۆستایەتیو هاندەرە حزبیەكان یان هەر شتێكی تر لەم بارەوە كە پەیوەندی بە تاكی لێوەشاوەترو چاكترەوە نییە لەو شتانەدا كە پێویستە سەرپەرشتی كاروبارەكان بەسەر چاكتردا تێپەڕنو غەیری ئەو دابنێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**من ولي من امر المسلمين شيئا فولي رجلا وهو يجد من هو اصلح منه**

---

١) تيسير الوصول، ج١، ص١٨.

**فقد خان الله ورسوله)**.[١] واتە: هەر كەسێك هەندێك لە كاروباری موسڵمانان درایە دەستی یەكێكی كردە كاربەدەست، كە دەیتوانی لەو شایستە تر بكات بۆ موسڵمانان، ئەوا بە راستی خیانەتی كردووە لە خواو پێغەمبەرەكەی.

هەر كاتێك سەرۆكی حكومەت یان سەرجەمی لێپرسراوان كەسێك بۆ ئەركێكی دیاری كراو پەیدا نەكەن كە شیاوو شایەنی بێت، لەم جۆرە كاتانەدا پێویستە كەسێك هەڵبژێرن كە شایەنترە و بەناوی شایستەترینی تاكە ئامادەبووەكانەوە بۆ هەریەك لە ئەركە حكومییەكان تاكێك دابنێن، بەتایبەتی گرنگ ئەوەیە كە تەواوی هەوڵەكانی خۆی بخاتە گەڕ لە پێناو ئەنجامدانی ئەم ئەركە گرنگەدا، كە ئەمەش لە سنووری تواناداییە وەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ (**التغابن**: ١٦) واتە: تا دەتوانن لە خوا بترسن.

## پێوەدانگی چاكتر، شایستەیی، لە پێناو بەڕێوەبردنی كاروبارە گشتییەكاندا

لێرەدا كاتێك سەرۆكی حكومەتو كاربەدەستان پابەندن بە هەڵبژاردنی چاكترین تاكی ئامادەوە لە پیناو بەڕێوەبردنی ئەركێكدا كە دەیخەنە ژێر دەستییەوە، لە ئەنجامدانی ئەم كارەدا ئازادن، پێویستە بزانن پێوەری دیاری كردنی شایستەیی تاكەكان بریتییە لە تواناو سپاردەپارێزی (ئەمانەتداری)، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦﴾ (**القصص**: ٢٦). واتە: ئەو باشترین كەسێكە كە بەكاری بگریت، چونكە هەم بە توانایەو هەم دەستپاكو كار دروستە.

**(القوة)**یش بوونی ئەو شایستەییو توانایەیە لە پێناو بەجێهێنانی كاروبارە پەیوەندداركان بە ئەركە حكومەتییەكانەوە كە پەیوەستە بە جۆری ئەو جیاوازییەوە كە لە تواناكاندا هەیە، ئامانەتداریش پەیوەندی بە بەڕێوەبردنی كاروبارەكانەوە هەیە بە پێی بڕیارە شەرعییەكانو واتای ترسانە لە خوای گەورە و ئەو چاودێرە بەسەریەوە، نەوەك ترسان لە خەڵكیو بەرجەستەكردنی ڕەزامەندییان.

---

١) السياسة الشرعية، ابن تيمية، ص٤.

## سەرپەرشتی کردنی کاروبارە گشتییەکان لە سەردەمی ئێستادا

ئەگەر لە روانگەی شەریعەتەوە داواکردنی ئەرکی حکومەتی نادروست بێت، لە لایەن خاوەن فەرمانەکانیشەوە ئازادی کارکردن هەبێت لە پێناو هەڵبژاردنی تاکی شایستە بۆ ئەرکە گشتییەکان، ئەوا لە سەردەمی ئێستەدا بە جۆرێك ئەتوانرێ ئەم دەستورە پیادە بکرێت؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پێویستە بوترێت ئەرکە گرنگە حکومییەکان وەك: وەزارەت، فەرماندەیی سوپا، سەرۆکایەتی رێکخراوە بەرێوەبەرایەتییەکان، پێویست دەکات کە سەرۆکی حکومەت کۆمەڵە تاکێکی شایستە لە جێگەیاندا دابنێت و لەم وێنەدا دەستووری پێشووی شەرعی پێوەری شایستە تر پیادە بکات.

لە تایبەتمەندی ئەرکەکانی تردا باوەڕ ناکرێ کە لێپرساراوان لە ریگەی هەڵبژاردنی راستەوخۆوە تاکی لە ئەستۆگری شایستەتر بەدەست بێنن، بەڵکو ئەوەی جێگەی پەسەندە ئەوەیە کە چەند دەستوورێك (ضوابط)ێك لەو پێناوەدا لەبەرچاو بگرن کە مەرجەکانی قبوڵکردنی ئەرکە حکومەتییەکان و لایەنی کەم مەرجی (بەس بوون کیفایەت)ی تیادا بەند بکرێت و رێگە بەداواکاران بدرێت کە پێشنیازەکانی خۆیان پیشان بدەن، وە ئەرکی لێپرساوەکانە کە لە بارەی پێشنیارەکانیانەوە بەو جۆرەی پێویست دەکات لە (بەس بوونو کیفایەتو ئامانەتداری) لە دیدگایەکی کراوەوە دوور لە تەسك بینی و بێ کارتێکردنی میانەکاری یا خزمایەتی یا هاندەرە حزبییەکان لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەنو هەرکەسێك شیاو بوو خاوەنی زۆرترین مەرج بوو دایبنێن. با لە پێچەوانەکانی خۆشیان بن، وە ئەگەر خاوەنی ئەو مەرجانە نەبوون داخوازییەکەی پەسەند نەکەن با دۆستو خۆشەویستی خۆشیان بن.

ئەو هێزو دەسەڵاتەی کە لە ژێر دەستی سەرۆکی حکومەتو سەرجەم کارمەندانیدایە لە راستیدا جۆرێکە لە سپاردە (ئەمانەت) پێویستە لەسەریان لە رێگەی رەزامەندی خوای گەورەدا بەکاری بێنن، رەزامەندی خوای گەورەش کاتێك دێتە دی کە بە پێی پێوانە شەرعییەکان هەڵبژێرێ، نەوەك لێپرساوییەکان ببەخشن بە نزیکەکانی خۆیانو تاکە

شايستەو شارەزاكانيش بىٚ بەش بكريٚن كە ئەمەش خيانەت كردنە لە ئەمانەتو بەفيرِۆدانو گوىٚ پىٚ نەدانيٚتى.

پيٚغەمبەر ﷺ دەفەرمويٚت: (**اذا ضيعت الامانة فانتظر الساعة، قيل وكيف اضاعتها؟ قال: اذا وسد الامر الى غير اهله**).[1] واتە: هەركات سپاردە پشت گوىٚ خراو بەفيرِۆ درا چاوەرِيٚى قيامەت بن، وتيان پشتگويٚخستنى چۆن چۆنە؟ فەرمووى: ئەگەر كاروبار درايە دەست كەسانيٚك شياوى نەبوون.

## ليٚكۆلٚينەوەى دووەم

## مافە گشتييەكانى تاك

### پيٚناسەى مافە گشتييەكان

مافە گشتييەكان، بريتين لەو مافە پيٚويستانەى كە مرۆڤ بە بەلٚگەى ئەوەى تاكيٚكى كۆمەلٚگايە و ناتوانيٚت ليٚيان بىٚ بەش بيٚتو لە پيٚناو لە پاريٚزگارى لە گيانو مالٚو ئازادييەكانيدا دانراون.[2]

مافناسان ئەم مافانە دابەش دەكەن بەسەر دوو بەشى گرنگدا:

**يەكەم: يەكسانى.**

**دووەم: ئازادى.**

يەكسانى بەسەر هەموو جۆرە جياوازەكانيدا دابەش دەكريٚت لەوانە يەكسانى لەبەرامبەر ياساداو يەكسانى لەبەرامبەر دادوەريدا (قەزاوەت).

هەروەها ئازاديش بەسەر چەندەها جۆردا دابەش دەكريٚت لەوانە:

ئازادييە كەسايەتييەكان، مافى مولٚكدارى، ريٚزى نيشتەجيٚى، ئازادى بيروباوەرِو پەرستش، ئازادى راو فيٚربوونو.. هتد.[3]

---

١) تيسير الوصول، ج١، ص٣٢.

٢) أصول القانون، سنهوري، ص٢٦٨.

١) الديمقراطية الاسلامية، دكتور عثمان خليل، ص٢٣.

## چۆنیەتی لێکۆڵینەوە

لە لیکۆڵینەوەی مافە گشتییەکاندا لەشەریعەتی ئیسلامدا پەیڕەوی لە دابەشکردنی مافناسان دەکەین تا لە روانگەی ئەم مافانەوە تەرازووی بەهرەمەندی تاکەکان ببینین لە ژێر سایەی ئیسلامدا، لەسەر ئەم بنەمایە لێکۆڵینەوەکە بەسەر دوو بابەتدا دابەش دەکەین:

١ـ یەکسانی.

٢ـ ئازادییەکان.

## بابەتی یەکەم: "یەکسانی"

## جێگای یەکسانی لە شەریعەتی ئیسلامدا

یەکسانی لەشەریعەتی ئیسلامدا بنەمایەکی گرنگەو ئیسلام سەرجەمی تاکەکانی مرۆڤ لەم بنەمایەدا بەیەکسان دەزانێو لە پێشترینیان لە بەرامبەر ئەوانی تردا لەسەر بنچینەی کاری چاکەو خێر کە ئەنجامی دەدەن، دەستنیشان دەکات، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ (**الحجرات**: ١٣). واتە: ئەی خەلکینە بێگومان ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردووەو کردوومانن بە چەندەها گەلو تیرەو هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتری بناسنو پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە، بەراستی بەرێزترینتان لای خوا لە خواترسترینتانە.

بەم پێیە مرۆڤەکان لە یەك تاکە بنچینەوە پێکهاتووە و نەکراون بە نەتەوەو هۆزی جۆربەجۆر تەنها لەبەر ناسینی یەکتر نەبێت و هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری لەژێر سایەی ناسینی نەیێت، نەك بۆ ئەوەی شانازی بە رەچەڵەكو نەژادی خۆیانەوە بکەنو لەی ئەنجامی ئەم شانازی کردنەدا دووچاری سەرکەشیو ستەمو نارِەوایی بنو دەست بکەن بە خۆ بەرزکردنەوە لەسەر بنەڕتی نەژادو رەچەڵەك و هۆز.

بەم بەڵگەیە ئیسلام ویستوویەتی کە تیرەگەرایی نەفامی و شانازی کردن بە رەگەزو رەنگەوە ریشەکێش بکاتو تەرازوو و پێداونگی بەرزتری لە نێوان مرۆڤەکاندا جێگیر کردووە لەسەر

بنەمای بەرجەستەکردنی رەوشتی جوانو بەجیهێنانی کردەوەی چاکەو ئەو شتانەی لە چەمکی لەخواترسان دایە کە لە دەروونو رۆحیاندا جێگیرە.

بنەمای یەکسانی لەشەریعەتدا رەگو ریشەیەکی قووڵی هەیەو رەواڵەتەکەی لە زۆرێك لە بڕیارە شەرعییەکانو بنەماکاندا دەتوانرێت بەرجەستە بکرێت، کە لە نێوانیاندا دوو بابەت شیی دەکەینەوە:

١ـ یەکسانی لەبەرامبەر یاسادا

٢ـ یەکسانی لەبەرامبەر دادوەرییدا

**ا ـ یەکسانی لەبەرامبەر یاسادا**

یەکسانی لەبەردەم یاسادا یەکێکە لە رواڵەتە بنچینەیی یەکانی یەکسانی و ئەو شتەیە کە دادپەروەری ئیسلامی فەرمانی پێ دەکات.

بەم پێیە یاسا لەسەر هەموان پیادە دەکرێت بەبێ ئەوەی بە هۆکاری نەتەوایەتی، رەنگ، پلەوپایە، سامان، خزمایەتی، خۆشەویستیو تەنانەت بیروباوەڕو[1] جۆرەها بابەتی تر کە فاکتەری دروستکردنی جیاوازین لە نێوان مرۆڤەکاندا، لە پێشتر (امتیاز) لەبەرچاو بگیرێت.

لە فەرموودەیەکی صەحیح دا هاتووە: **(إنما اهلك الذين من قبلكم انهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف إقاموا عليه الحد، وإيم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها)**.[2] واتە: بەراستی گەلانی پێش ئێوە کە لەناوچوون بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەگەر گەورەو ناودارێك لە ناویاندا دزی بکردایە، ئازادیان دەکردو وازیان لێ دەهینا، بەڵام ئەگەر لاوازو بێ کەسێك لەناویاندا دزی بکردایە تۆڵەیان لێ دەسەندەوە، سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی.

---

١) بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری: (أحكام الذميين والمستأمنين في دار الاسلام) بکە کە کتێبێکی ترە لە کتێبەکانی دانەر.

٢) تيسير الوصول، ج٢، ص١٤.

## گرنگی یەکسانی لە بەرامبەر یاسادا

پیادەکردنی ئەم یەکسانییە هۆکاری رەزامەندی و دڵنیایی هاووڵاتیانە لە پێناو دەست گەیشتن بە مافەکانیانو فاکتەری دروست بوونی هەستی پێویستی مانەوەو دامەزراوی حکومەتەکەیانە، لەم رووەوەیە کە لە پێناو پاراستنی و بەردەوامبوونیدا، پاسەوانی و بەرگری لێ دەکەن.

بەڵام هەرکات ئەم یەکسانیە لەبەرچاو نەگیرێ و یاسا تەنیا بەسەر لاوازەکاندا پیادە بکرێو بەسەر بەهێزەکاندا هیچ، هەروەها بەسەر گومناوەکاندا پیادە بکرێتو بەسەر ناودارەکاندا پیادەنەکرێت، لەم کاتەدا خەڵکی هەست بە نائومێدی دەکەن و پەیوەندییان بە حکومەتەوە سست دەبێتو لە ئەنجامدا بوونو نەبوونی حکومەت لەلایان یەکسان دەبێتو ستەمو نارەوایی کۆمەڵگا داگیر دەکات، چونکە ماف موڵکی دەسەڵاتدارانو بەهێزەکانە، نەك موڵکی خاوەنەکانیان، وە وشەی کۆتایی (کۆتا وشە) دەسەلات دەری دەکات، نەك یاسا، لەبەرئەوە هەرکاتێك حکومەت دووچاری ئەم جۆرە بارە بوو پایەداری و دامەزراوی نامێنێتو لەم رووەیشەوەیە کە دەڵێن: (**تبقى الدولة العادلة وان كانت كافرة، وتنفى الدولة الظالمة ولو كانت مسلمة**). واتە: حکومەتی دادپەروەر بەپایەداری دەمێنێتەوە گەرچی حکومەتی بێ باوەڕیش بێت، وە حکومەتی ستەمکار لەناو دەچێت ئەگەرچی حکومەتی ئیسلامیش بێت.

### لە نمونە کانی یەکسانی

لە نمونەکانی پیادەکردنی بنەمای یەکسانی لەبەرامبەر قانوندا ئەتوانرێت ئەم نموونەیە باس بکرێت، عەمری کوڕی عاص ـ فەرمان ڕەوای میسر ـ لە سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا (ﭬ) کوڕەکەی زللەیەکی کێشا بە یەکێك لە قیبتییەکاندا، لە کاتێکدا لە پێشبڕکێی ئەسپ سواریدا پێشی کەوتبوو، ئەویش لەلای عومەر کوڕی خەتتاب (ﭬ) شکاتی کرد، خەلیفەش نوێنەرێکی نارد بە دوای عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەیدا، کاتێك گەیشتنە لای فەرمووی ئایا ئەمە لە تۆی داوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: لێیدە، پیاوەکە

دەستی کرد بە لێدانی تا کاتێك دڵی ئارام بوو، عومەر پێی فەرموو: (زد ابن الاكرمين) زیاتر لەم کوڕی گەورەو رێزلێگیراوانە بدە، پاشان رووی کردە عەمری کوڕی عاصو فەرمووی: (منذ كم يا عمرو تعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا).[1] واتە: ئەی عەمر لە کەیەوە خەڵکیتان کردووە بە کۆیلەی خۆتان کە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون.

**٢- یەکسانی لەبەرامبەر دادوەریدا (قەزاوەت)**

سەرجەمی هاووڵاتیانی حکومەتی ئیسلامی یەکسانن لەبەردەم دادوەریی دادگادا لەم روانگەیەوەیە کە هەموان سەرپەرشتی ئەویان پەسەندکردووەو لە پەیامەکانی بەجێهێناندا، لەبەرزکردنەوەی ناکۆکیداو جێبەجێ کردنی دەقەکانو بەجێهێنانی بڕیارەکانداو پێویستی بەجێهێنانی دادپەروەری لە نێوان دوو لایەنی دژبەیەکدا هیچ جۆرە جیاوازیەك لە نێوان تاکێكو یەکێکی تردا نییە تەنانەت دوژمنانیش لە ژێر سایەی دادپەوەریی لە دادوەریو یەکسانی دا دەگەن بە سەرفرازی.

خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ ﴾ (**المائدة**: ٨) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە چاکی هەستن بە ئەنجامدانی شایەتی دادپەروەرانە لەبەر خوا، رقو دوژمنایەتی هیچ کەسو هیچ لایەك هەڵتان نەنێت کە لە دادپەروەری لادەن، دادپەروەر بن، ئەوا نزیکترە لە تەقواو خواناسینەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ ﴾ (**النساء**: ٥٨). واتە: ئەگەر دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا ئەوا دادپەروەرانە دادوەری بکەن.

یەکسانی لەبەرامبەر دادوەریدا تا ئەو شوێنەیە کە لە کاتی دادوەریکردندا لە نێوان تاکەکاندا پێویستە سەیرکردنیشیان وەك یەك وابێت، لەو نامەدا کە عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ) بۆ ئەبوموسای ئەشعەری دەنووسێ هاتووە: **(اس الناس في مجلسك وفي وجهك**

---

١) التشريع الاسلامي، خواصه ومراحله، محمد أبي زهرة.

وقضائك حتى لا يطمع شريف في حيفك، ولا ييأس ضعيف من عدلك).[١] واتە: لە دانیشتنتا و لەسەیرکردنتاو لە حوکم کردنتا بە جۆرێ لەگەڵ خەڵکیدا بجولێرەوە تا ئەوەی بەدەسەڵاتە چاو نەبڕێتە ستەمتو ئەوەش لاوازو بێ دەسەڵاتە بێ ئومێد نەبێت لە دادپەروەریت.

## بابەتی دووەم

## ئازادیە کەسایەتیەکان

### یەکەم: ئازادیە تاکە کەسیەکان

### پێناسەکەی:

ئازادیە تاکە کەسییەکان لە لای مافناسان بەم جۆرە پێناسە دەکرێت کە تاك ئازادی هاتنو رۆشتنی هەبێت، لە هەموو جۆرە لەسنوور دەرچوونێك پارێزراو بێتو هیچ کەسێك جگە لە داوای یاسایی مۆڵەتی دەستگیرکردنی، تۆڵە لێ سەندنەوەی یان زیندانی کردنی نەبێت، هەروەها ئازاد بێت لە چوونە دەرەوە لە سنووری قەڵەمڕەوی حکومەتو گەڕانەوەی.[٢]

### ئازادیە تاکە کەسیەکان لە دەقی شەرعی دا:

ئازادیە تاکە کەسییەکان بەو واتایەی کە مافناسان نیشانی دەدەن، هەروەها تا فراوانتریش لەوە، لە حکومەتی ئیسلامیدا لە پێناو تاکدا لەبەرچاو گیراوە، تێپەڕینی و سنوورترازاندنی بەستەم لەقەڵەم دەدرێت، کە ئیسلام ستەمکاریی بەشێوەیەکی رەها قەدەغە کردووە.

بە وردی لە جێبەجێ کردنی تۆڵە سەندنەوەکاندا و یاساکانی هێشتنەوەو بەرگرتنی ئیسلامی دەربارەی ئەوانەی سنووری ژیانو لاشەو ناموسی خەڵکی دەبەزێنن، پاراستنو پشتیوانی حکومەتی ئیسلامی لە تاك لە بەرانبەر سنوورشکاندنی ژیانو لاشەو ناموس روونتر دەبێتەوە.[٣]

---

١) اعلام الموقعين، ج١، ص٧٢.

٢) القانون الدولي الخاص المصري، دكتور عزالدين عبدالله، ج١، ص٢٨٧.

١) بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم بابەتە دەتوانیت سەیری (المدخل لدراسة الشرعية الاسلامية) بکەیت.

ئەم تۆڵەو سزایانە کە بۆ سنووربەزێنان لەبەرچاو گیراوە بەشكو گومان لەسەر مرۆڤ پیادە ناکرێت، چونکە لە بنەڕەتدا بێبەشبوونی مرۆڤە لە تاوان (**برائة الذمة**) لەبەرئەوە سزادان و تۆڵە لێکردنەوە نارەوایە مەگەر تاوانەکەی بسەلمێنرێت، ئەوەیش بەو پێوەرو ئەندازەیە دەبێت کە یاسای ئیسلام ئاماژەی پێکردووە.

هەروەها تۆڵەو سزای تاکێکی تاوانبار ناگوێزرێتەوە سەر تاکێکی تر کە بەشداریی تیادا نەکردووە. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ (**الاسراء**: ١٥). واتە: هیچ کەسێك گوناهو تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت.

قورئانی پیرۆز ئازادی تاکی لە ڕۆشتندا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر حەڵاڵ کردووەو بە مەبەستی ئامۆژگاری و پەندوەرگرتن و بەدەستهێنانی سامان خەڵکی بۆ بانگهێشت دەکات، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ (**یوسف**: ١٠٩). واتە: ئایا گەشتو گەڕان ناکەن بەسەر زەویدا تا بزانن سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان چۆن بووە.

هەروەها دەفەرمویت: ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ (**الملك**: ١٥). واتە: بگەڕێن بە هەموو گۆشەو کەنارێکیدا، لەو رزقو ڕۆزییەش بخۆن کە پێشکەشتان دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئەوە.

هەر شتێك خوای گەورە حەڵاڵی کردبێت حکومەتی ئیسلامیش بە حەڵاڵی دەزانێت، بەم پێیە گەشتو گەڕان بۆ تاك تیایدا ئازادە، مەگەر پێویستییەك دروست ببێت بخوازێت کە ئەو مافە لە هەندێك تاك بگیرێتەوە، وەك چۆن عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) ڕێگەی لە ژمارەیەك لە هاوەڵە پایەبڵندەکان گرت لە چوونە دەرەوەیان لە مەدینە تا بتوانێت سوود لە بۆچوونو ڕاوێژیان وەربگرێت.

## پاریزگاری كردنی ریزو سەربەرزی تاك لە لایەن حكومەتەوە

پاراستنی تاك لە لایەن حكومەتەوە سنووردار نییە تەنیا بە پاسەوانی كردنی ژیانو لاشەو ناموسییەوە لەبەرامبەر سنوورشكێنانداا، بەڵكو پەراوێزەكەی پاراستنی ریزو سەربەرزییەكەشی لە خۆدەگرێت لە بەرامبەر هەموو جۆرە سووك ژماردنو زەلیل كردنێكدا. لەبەرئەوە حكومەت تاك بەبێ ریز دانانیو مۆڵەتی بێریزكردنو بەكەمگرتنی بەكەس نادات، چونكە كەسایەتی موسڵمان پێویستە سەربەرزو بەریز بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (المنافقون: ٨). واتە: سەربەرزیو پایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرو باوەڕدارانە.

هیچ سوودێك لە لاوازكردنو زەلیلكردنی تاكدا نییە، هیچ كەس شایەنی هەڵگرتنی پەیامی ئیسلامی نییە جگە لە تاكێكی ئازادیخوازی خاوەن ریزو گەورەیی، لەبەرئەوە حكوومەتی ئیسلامی هەموو واتاكانی سەربەرزی، بەو شێوەیەی كە خوای گەورە دەیەوێت لە دەروونی موسڵماناندا پەروەردە دەكاتو بەر لە هەموو ئەو شتانە دەگرێت كە لەكەداری دەكات، یان دژایەتی لەگەڵ دەكات.

پێشەوا عومەری كوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بەم شێوەیە بە كاربەدەستانی خۆی دەفەرموێت: (لا تضربوا المسلمين فتذلوهم) واتە: (لە موسڵمانان مەدەن كە ببێتە هۆی زەلیلیو سەركزییان). هەروەها فەرمانی پێدەكردن لە كاتی حەجدا ئامادە بن، كاتێك كۆدەبوونەوە لەناو خەڵكەكەدا وتاری دەداو پێی دەفەرموون: (يا أيها الناس اني لم ابعث عمالى عليكم ليصيبوا من ابشاركم ولا من اموالكم، انما بعثتم ليحجزوا بينكم وليقسموا فيئكم بينكم، فمن فعل به غير ذلك فليقم).[١] واتە: ئەی خەڵكینە كارگوزارو فەرمانبەرەكانم بۆ ئەوە نەناردووە بۆ لاتان كە تووشی ئێشو ئازارتان بكەنو خۆیان بكەن بە خاوەن ماڵ و سامانتان، بەڵكو ناردوومن بۆ ئەوەی كە دادپەروەربن لە نێوانتانداو غەنیمەو دەسهاتەكان بەرێكی دابەش بكەن بەسەرتاندا، هەركەسێكتان بەو جۆرە نەجولاّیەوە لەبەرامبەریدا بوەستێ.

١) طبقات ابن سعد، ج٣، ص١٩٣.

ئەگەر حكومەتيش لە ئەركەكانيدا لەبەرامبەر پاراستنى ريزو سەربەرزى تاكدا، كەمو كورتى بنوێنێ، روونە كەسايەتى موسڵمان سەر بۆ هيچ جۆرە بە بەندەكردنو زەليل كردنێك دانانەوێت، چونكە بيروباوەڕەكەى لە هەموو جۆرە سەر كزىو سەرنەوينێك دەيگێڕێتەوەو هەر ئەم بيروباوەڕەيە كە بەستوويەتييەوە بە خواى گەورەوە، هيچ كەسێك ئەوەندە بە گەورە نابينێت لێى بترسێتو لە بەرامبەريدا سەر نەوى بكات، جگە لە پەروەردگار كەسێكى تر بە شايستەى پەرستن نازانێت.

لەبەردەم خوادا هەموويان بەندەن و پێويستيان بە ويستى خواى گەورەيە، شايەنى ئەوەنين كەسێك لە پێناوياندا سەركز بكاتو لێيان بترسێ، چونكە موسڵمان كارى خۆى بە خواى گەورە سپاردووەو پەرستشيشى بە دڵسۆزى بۆ ئەو داناوە، رەوا نييە كە بۆ غەيرى ئەو كڕنووش بەرێتو بەندەيى بۆ بكات.

وە ئەوەش كە لەسەر حكومەتى ئيسلامى پێويست دەبێت ئەوەيە كە تاك هاوڕێك بە بيروباوەڕە ئيسلامييەكەى ژيان بەرێتە سەرو بەردەوامى بە ژيان بدات، وە بيروباوەڕى ئيسلاميش داخوازى ئەوە دەكات موسڵمان ئابڕومەندو سەربەرز بێت، نەك سەركزو زەليل، وە حكومەت پێويستە كۆشش بكات لە پێناو پاراستنى ريزو سەربەرزى تاكدا.

## ئازادييە تاكە كەسييەكان بۆ غەيرى موسڵمان

ئازادييە تاكە كەسييەكان بۆ غەيرى موسڵمانانيش لەبەرچاو گيراوە، ياساناسەكان بەهەمان شێوە لەمبارەوە ياسايەكيان روونكردووەتەوە **(لهم مالنا وعليهم ما علينا)** هەرچييەك بۆ ئێمە هەيە بۆ ئەوانيش هەيە، هەرچييەك لەسەر ئێمەيە لەسەر ئەوانيشە.

وە بەهەمان شێوە ئيمامى عەلى (رضي الله عنه) دەفەرموێت: **(انما بذلوا الجزية لتكون اموالهم كاموالنا ودماءهم كدمائنا)**.[1] واتە: ئەوان لەبەرئەوە جزيەيان داوە تا ماڵو سامانيان وەك ماڵو سامانى ئێمەى لێ بێتو خوێنيشيان وەك خوێنى ئێمە لێ بێت.

١)الطاساني، ج٧، ص١١١. المغني، ج٨، ص٤٤٥.

لە راستیدا غەیرە موسڵمان لە سایەی چاودێری شەریعەتو پارێزگاری حکومەتدا لە دادپەروەرییەکی گەورەدا بەشدارە، لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من آذي ذميا فنا خصمه، ومن كنت خصمه خصمته يوم القيامة).[1] واتە: هەرکەسێك زمییەك (ئەو غەیرە موسڵمانانەی لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدایە) ئازار بدات ئەوا من دوژمنی ئەوم، هەرکەسێك من دوژمنی بم، لە رۆژی دوایشدا هەر دوژمنیم.

لەبەر رۆشنایی فەرموودەکەی پێغەمبەردا ﷺ بەرامبەر بە غەیرە موسڵمانان، چەندەها وتەی ئاشکرا لە یاساناسەکانەوە هاتووە دەربارەی پێویست بوونی پارێزگاری کردنیانو رێزگرتن لە کێشەکانیان.

یەکێك لە یاساناسەکان کەناوی (قرافی)یە دەڵێت: "ئەگەر کەسێك زمی بێت، جەنگ کاران بە نیازی ئەوەوە هاتنە ناو خاکی ئێمەوە، پێویستە بە چەك، هەتا بە ئێسكو پروسکی ئاژەڵان بچینە دەرەوە بۆ جەنگان لەگەڵیانداو لە پێناو پاراستنیدا خۆمان بەخت بکەین، بۆ پاراستنو پارێزگاری کردن لە ئەو کەسەی کە لە ئەستۆی خواو پێغەمبەر ﷺ دایە، بە پێچەوانەشەوە تەسلیم کردنیان بە دوژمن بایەخ نەدان و فەرامۆشکردنی پەیمانو بەڵێنە دەربارەی زمیەکان".[2]

## دووەم: ئازادی بیروباوەڕو پەرستش

## لا اكراه في الدين (زۆرکردن لە پەسەندکردنی دیندا نییە)

ئیسلام زۆر لە مرۆڤ ناکات بۆ گۆڕینی بیروباوەڕی خۆیو ملکەچ کردن بۆ ئیسلام، هەرچەندە مرۆڤی بۆ بانگهێشت دەکات، بەڵام ئەم بانگهێشتە بە واتای بەزۆر پێ پەسەندکردنی نییە، بەڵکو بانگەواز بۆ ئیسلام شتێکەو زۆرەملێ کردن بۆی شتێکی ترە، بابەتی یەکەم رەوایە، بەڵام بابەتی دووەم قەدەغەیەو نارەوایە.

١) الجامع الصغير، السيوطي، ج٢، ص٤٧٣.

٢) الفروق، قرافي، ج٢، ص١٣.

خوای گەورە لە بارەی بانگەوازکردن بەرەو ئیسلام دەفەرمویّت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ (النحل: ١٢٥). واتە: بانگەواز بكە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بە حیكمەت و داناییو ئامۆژگاری جوانو گفتوگۆ بە جوانترین شێوە.

لەبارەی زۆرلێكردن و بەسەردا دابڕین بەم شێوەیە دەفەرمویّت: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ (البقرة: ٢٥٦) واتە: بەهیچ جۆرێك زۆر كردن نییە لە وەرگرتنو پەسەندكردنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، چونكە بە ڕاستی ڕێگای چاكو دروست ڕوون بۆتەوەو جیابۆتەوە لە گومڕایی.

یەكێك لەو یاسایانەی كە لە شەریعەتی ئیسلام دا دانراوە ئەوەیە كە (نتركهم وما يدينون) وازدەهێنین لە خۆتانو لەوەی دەیپەرستن.

لەبەرئەوە حكومەتی ئیسلامی ڕەخنە لە غەیرە موسڵمانان ناگرێت لەسەر بیروباوەڕو پەرستنیان، لە نامەیەكدا كە پێغەمبەر ﷺ بۆ دانیشتوانی نەجرانی نووسی، هاتووە: **(ولنجران وحاشيتها جوار الله وذمة محمد النبـي، رسول الله على اموالهم وملتهم وبيعهم وكل ما تحت ايديهم).**[1] واتە: دانیشتوانی نەجران و دەوروبەری لەبواری ماڵو سامان، دین، كڕینو فرۆشتن، هەموو ئەو شتانەی لەژێر دەستیاندایە، لە پەنای خواو ئەستۆی موحەممەدی پێغەمبەریدان ﷺ.

تا ئێستەش چەندەها كەنیسەو كڵێسا لەوڵاتە ئیسلامیەكاندا ماونەتەوە، كە لە سەردەمە جۆربەجۆرەكانی حكومەتی ئیسلامیدا نە لە لایەن موسڵمانانەوەو نە لە لایەن حكومەتەوە زەرەریان پێ نەگەیەنراوە، بەڵكو حكومەت پارێزگاری لێكردوونو ڕێوشوێنی ئەنجامدانی پەرستشی تیایاندا بەدی هێناوە بۆ پەیڕەوانی.

---

١) الخراج، ابي يوسف، ص٩١.

## ئازادی بیروباوەڕ لە ئاستی بڵندیدا

ئازادی بیروباوەڕ لە فیقهی ئیسلامیدا لە ئاستێکدایە کە باوەڕ ناکرێت هیچ یاساو بەرنامەیەکی تر بەو ئاستە گەشتبێت، پێشەوا شافیعی لەبارەی موسڵمان بوونی یەکێك لە هەردوو هاوسەری غەیرە موسڵمان (ژنو پیاو)ەوە پێشنیازو دەرخستنی موسڵمان بوون لەسەر ئەوی تریان ناکات، بە پێچەوانەی (حەنەفییەکان)ەوە، کە ئەوان لە پێناو تەواوکردنی بەڵگەدا پێیان وایە پێویستە کە دووەمیش موسڵمان بێت.

لەسەر وتەی پێشەوا شافیعی **(ان في هذا العرض تعرضا لهم وقد ضمنا بعقد الذمة الا نتعرض لهم).**[1] واتە: ئێمە لەبارەی ئەم پێشنیارەوە پێچەوانەی ئەوانین (حەنەفیەکان) کە لە کاتێکدا پابەندبووین بە پەیمانی زمیەکانەوە کە پێچەوانەیان نەبین.

بەبۆچوونی پێشەوا شافیعی دابڕینی موسڵمان بوون لەسەر هاوسەری دووەم کە موسڵمان نەبووە، بە جۆرێك بەهێرش کردنە سەر و بە زۆر پێ پەسەندکردنی ئیسلام دەژمێرریۆو ناڕەوایە.

دەبینین کە ئازادی بیروباوەڕ لە فیقهی ئیسلامیدا جێگەو پلەیەکی بەرزی پێ دراوە.

## تۆڵەسەندنەوە لە هەڵگەڕاوە (مرتد) پەیوەندی بە ئازادی بیروباوەڕەوە نییە

ئەوەی کە باسمانکرد نابێت تێکەڵی بکەین لەگەڵ تۆڵەکردنەوە لە هەڵگەڕاوەدا یان ئەو موسڵمانەی لە ئیسلام دەرچووە، چونکە ئەمە بابەتێکەو ئەویش کە لە بارەی ئازادی بیروباوەڕەوە وتمان بابەتێکی ترە.

موسڵمان بە بەڵگەی ئەوەی ئیسلامی پەسەند کردووە، پێویستە پابەند بێت بە بڕیارو یاساکانیەوەو هەرکاتێك هەڵگەڕایەوە ئەوا پەیمانو پابەندێتی خۆی پچڕاندووەو خیانەتی لە حکومەت کردووە و بێ پەروا بووە بەرامبەری، لەبەرئەوە شایەنی سزایە.

---

١) شرح الكنز، زيلمي، ج١، ص١٧٤.

وەك بەو شێوەیەیشی لە مافەكاندا بەناوبانگە، هەركاتێك كەسێك ئەو شتە بزانێت، كە پێویستە پێیەوە پابەند بێت چاوپۆشی لێ بكاتو فەراموشی بكات، شایەنی سزایە.

### سێیەم: رێزی ماڵو جێگەی نیشتەجێ بوون

لە حكومەتی ئیسلامیدا تاك خاوەنی رێزو شوێنی دانیشتنێتی و هیچ كەسێك بەبێ مۆڵەتو رەزامەندی خۆی بۆی نییە بێتە ماڵەكەیەوە، چونكە ماڵ جێگەی ئارامیو دانیشتنی خێزانە و جێگەی نهێنییەكانیانەو هەموو جۆرە دەستدرێژیی كردنەسەرێكی بە سنووربەزاندن لە بەرامبەر خودی ئەو كەسەدا دەژمێردرێتو نادروست و ناڕەوایە.

لە قورئانی پیرۆزدا دەقی روونو ئاشكرا دەربارەی قەدەغەكردنی چوونە ناو ماڵو جێگەی تاكەوە بەبێ مۆڵەتی خۆی هاتووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴿٢٨﴾ ﴾ (**النور**: ٢٧-٢٨). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێكی تر جگە لە ماڵەكانی خۆتان، هەتا مۆڵەت دەدرێنو (پاشان) سلاو لە ماڵەكە بكەن، ئەوە چاكترە بۆتان بەو شێوەیە رەفتار بكەن، تاكو لە یادتان بێتو فەراموشی نەكەن، پاشان ئەگەر كەستان نەبینی، یان هەستتان كرد كە كەس لە ماڵ نییە مەچنە ژوورەوە هەتا مۆڵەت نەدرێن، ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە ئەوە چاكترە بۆتان، وە (بزانن) خوای گەورە ئاگادارە بە كارو كردەوەكانتان.

### چوارەم: ئازادی كار

### سنووری ئازادی كار بۆ تاك

كاكردن لە شەریعەتی ئیسلامدا تا ئەو كاتەی حەلالو رێگە پێ دراو بێت رێزی لێ گیراوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **(ما اكل ابن آدم طعاماً خيراً من عمل يده، وان نبـي الله داود كان ياكل من عمل يده)**. واتە: مرۆڤ هیچ خواردنێك ناخوات باشتر بێت لەوەی كە

بەدەستی خۆی پەیدای دەكات، پێغەمبەری خوا داود لە ئەنجامی كارو ئیشی دەستی خۆی دەخوارد.

بەم پێیە تاك لە حكومەتی ئیسلامیدا دەتوانێت ئەو كارانەی وەك: بازرگانی، پیشەسازیو كشتوكاڵ ئەنجام بدات بەو مەرجەی دوورەپەرێزی بكات لەوشتانەی كە شەریعەتی ئیسلام قەدەغەی كردوون وەك مامەڵەكردنی سو (ریبا)و لەو كارانەدا كە بە حەڵاڵ دانراون چاودێران بەها ئەخلاقیەكان بكات و بەهۆی ئەو كارانەوە هیچ زەرەرو زیانێك بە خەڵكی نەگەیەنێت، تا حكومەتی ئیسلامی ئەو كارانەی لێ قەدەغە بكات.

هەركاتێك تاك هەستێت بەئەنجامدانی ئیشو كارێكی حەڵاڵ، بەرهەمەكەی مافی تەواوی خۆیەتی، چونكە لە هەوڵو كۆششی خۆیەوە بەرهەمی هێناوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ (النجم: ٣٩). واتە: بەراستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نییە تەنها ئەوە نەبێت كە بۆی تێكۆشاوە.

## حكومەت پێویستە بەر بگرێت لە بازرگانی كارمەندەكانی خۆی

رەوا نییە بۆ حكومەت كە كەسێك لا بدات لەسەر ئیشو كارێكی حەڵاڵ مەگەر بە بەڵگەیەكی شەرعی نەبێت، لەم رووەوەیە كە پێویستە بەربگرێت لە بازرگانی كردنو كۆكردنەوەی سەروەت لە لایەن كارمەندانەوە، تا بە هۆی هێزو دەسەڵاتیانەوە زیادەڕەوی نەكەن.

هەر لەسەر ئەم بەڵگەیە پێشەوا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لێپرسینەوەی لەگەڵ والیەكانی خۆی دا دەكرد دەربارەی ئەو سەروەتو سامانەی لایان بووە.

هەر كاتێك یەكێك لەوانە بیوتایە، من بازرگانیم كردووەو سوودو قازانجم لێیەوە دەست كەوتووە، عومەر دەیفەرمو بەراستی ئێمە تۆمان بۆ بازرگانی كردن رەوانە نەكردبوو.(١)

---

١) ملامح الشرعي الاسلامي، مصطفى الزرقا.

## مانگرتن و دەستكێشانەوە لە كار

هەر كاتێك تاكێك مافی ئەنجامدانی ئەو كارەی هەبێت كە خۆی حەزی لێ دەكات، مافی ئەوەیشی هەیە كە هەركات ویستی وازی لێ بهێنێت، بەڵام ئەم مافە بەو مەرجەیە كە زیان بە بەرژەوەندی گشتی نەگەیەنێت.

لەم رووەوە یاساناسەكان دەڵێن: (دروستە فەرمانڕەوا ئەو خاوەن پیشەو كارانەی كە واز لە كارەكانیان دەهێنن و خەڵكیش پێویستی بەو پیشەو ئیشانە هەیە، پابەند بكات بە كارەكانیانەوەو بە نرخی رۆژ موچەیان پێبدات).[١]

بەم پێیە لە حكومەتی ئیسلامیدا هیچ بەڵگەیەكی پەسەندكراو نییە بۆ دەستكێشانەوەو مانگرتنی گشتی لە كار لە لایەن كرێكارانەوە، چونكە ئەم مانگرتنە دەبێتە هۆی لە كارخستنی بەرهەمهێنان و زیانگەیاندن بە بەرژەوەندی گشتی، ئەگەر بوترێت ئەمە فاكتەرێكە بۆ خۆراستكردنەوەی خاوەن كارەكان و چاودێریكردنی ویژدان لە رووی رێككردنەوەو هاووەزنكردنی موچەوە بۆ كرێكاران، ئەم خێرخوازییە هیچ جێگەیەكی لە حكومەتی ئیسلامیی دا نییە، چونكە ئەركی حكومەتە تا دادپەروەری پیادە بكات، وە یەكێك لە ئامانجەكانی دادپەروەری ئەوەیە كە ئەو كرێكارانەی لە دەزگا حكومییەكاندا كار دەكەن موچەیەكی دەداپەروەرانە وەربگرن، ئەگەر لەلای هاونیشتمانییەكانیشیان خەریكی ئیش كردنن پێویستە كرێیەكی تەواویان پێبدرێت، ئەگەر سەرپێچی بكرێت لە پێدانی ئەو جۆرە موچەیەدا ئەوا حكومەتی ئیسلامی لە پێناو پیادەكردنی دادپەروەریدا دێتە ناوەوە، لێرەشدا نە كرێكار زیان دەكات و نە خاوەن كار، لە ئەنجامی كاروبارە كۆمەڵێیەكاندا لە وەستان و كێشە رزگاری دەبێ و دادەمەزرێت.

١) الطرق الحكمة، ابن القيم، ص١٤.

## پێنجەم: ئازادی خاوەندارێتی

### شەرع دانی بە مافی موڵکایەتیدا ناوە

شەریعەتی ئیسلام دانی بە مافی موڵکایەتیو ئازادی موڵکداریدا دەنێت بۆ تاکەکانو رێز لەم مافە دەگرێت و فەرمان بە بەرێزسەیرکردنی دەکاتو سنوور شکاندنی بە گوناهی گەورە دەژمێرێو لەپێناو بەرگرتن لەو کەسانەی سنووری موڵکداری دەبەزێنن سزای دنیایی پیادە دەکات.

### سنورەکانی موڵکایەتی

لەگەڵ ئەوەدا کە شەریعەت مافی خاوەندارێتی و مافی هەڵسوکەوتی خاوەن موڵك لە موڵکەکەیدا بە رەسمی دەناسێت، ئەم مافە دەبەستێتەوە بە سەرچاوەی پەیدابوونو فراوان بوونو بەخشین و لێدەرکردن و کۆمەڵە مافێکی تر کە خەڵکی تیایدا هەیانە.

هۆکارەکانی بەرجەستەکردنو بەدی هێنانی ئەم مافە لەسەر ئەو بونیادەی کە شەریعەت دایناوە، بریتییە لە ئیشو کاری حەلاڵ و رێگە پێدراو بە هەموو جۆرێکییەوە بۆ ماوەو پەیمانەکان (**میراث وعقود**)، لەبەرئەوە ئەو شتانەی کە شەریعەت حەرامو قەدەغەی کردوون وەك: دزی، تالآنی، قومار، سوود وەرگرتن بە هۆی دەسەلاتەوە، سوو بەرتیل، هاوشێوەکانی، هۆکاری دەستەبەرکردنو پێکەوەنانی موڵك نین.

هەر کاتێك سامانو دارایی مرۆڤ لەسەر بونیادێکی شەرعی جێگیر (**ثابت**) بوو. دەتوانێت هەڵسوکەوتی تیادا بکاتو لەو رێگایانەوە کە قەدەغە نین فراوانیان بکاتو گەشەیان پێ بدات، بەلآم بۆی دروست نییە بە هۆی غەشو سوو هاوشێوەکانییەوە، کە دژایەتییان لەگەڵ دەستوورە شەرعییەکانو بەها رەوشتییەکاندا هەیە، گەشەیان پێ بدات.

گەرچی شەریعەت رێزی لە خاوەندارێتی ناوە، بەلآم لە کاتی پێویستیو لە پێناو بەرژەوەندییەکی شەرعیدا، دروستەو دەتوانێت لێی بستێنێتەوە، بەلآم لە دواییدا بەشێوەیەکی تەواو قەرەبووی بۆ دەکاتەوە.

ئەو مافانەی كە شەريعەت لە موڵكايەتيى دا پێويستى كردووە زۆرن، لەوانە: بژێوی كێشانى نزيكان، زەكاتو يارمەتيدانى خاوەن پێويستييەكان، كاتێك كە زەكات پێويستيەكانيان پڕ نەكاتەوە، وە لە (بيت المال)يشدا سامانێك نەبێت پێيويستييەكانيان جێبەجێ بكات، ئەمەش ئەو بابەتەيە كە ئەنجومەنى هاريكارى ئيسلامى بانگەشەی بۆ دەكات.

## شەشەم: ئازادی رادەربڕين

### جێگەی ئەم ئازادييە لە شەريعەتدا:

ئازادى رادەربڕين يەكێكە لە مافەكانى تاك، كە لە حكومەتى ئيسلاميدا لەوپەڕی گرنگى و بايەخدا جێگەی گرتووە، بچووك كردنەوەی ئەم مافە، لە لايەن حكومەتەوە ناڕەوايە، بەهەمان شێوە بۆ تاكيش رەوا نييە، كە چاوپۆشى لێ بكات، چونكە پێويستييەكە لە پێناو بوونى لايەنى فيكرىو مرۆڤايەتى تاكدا، هەروەها لە پێناو بەجێهێنانى فەريزە ئيسلامييەكاندا لە لايەن تاكە موسڵمانەكانەوە دووبارە پێويستەو زەرورييە.

فەرمان كردن بە چاكەو قەدەغەی خراپە لە گرنگترين فەريزە ئيسلامييەكانن و بەجێهێنانيان پەيوەستە بە ئازادى رادەربڕينەوە.

خواى گەورە لە قورئانى پيرۆزدا لەبارەی فەرمان كردن بە چاكەو قەدەغەكردنى خراپە بەم شێوەيە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾ (**العصر**: ١-٣). واتە: سوێند بە زەمانە، بەراستى ئادەميزاد لە زەرەرمەنديدايە، جگە لەوانەی كە باوەڕيان هێناوەو كاروكردەوە چاكەكانيان ئەنجامداوەو ئامۆژگارى يەكتريان كردووە لەسەر راستىو ئارامگرتن.

﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ (**التوبة**: ٧١)واتە: باوەڕداران لە پياوانو لە ئافرەتان هەندێكيان خۆشەويستو هاوكارى يەكترن، فەرمان بە چاكە دەكەنو قەدەغەی خراپە دەكەن.

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ (ال عمران: ١٠٤). واتە: پێویستە لەناو ئێوەدا کۆمەڵێك دروست ببێت بانگەواز بکەن بۆ لای چاکەو فەرمان بە چاکە بکەنو بەرگری لە خراپە بکەن.

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە: (من رآی منكم منكراً فليغيره بيده، فان لم يستطيع فبلسانه، فان لم يستطيع فبقلبه وذلك أضعف الايمان). واتە: هەرکەسێك لە ئێوە نارەوایی و خراپەیەکی بینی، با بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بە زمان بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت، وەئەمەیش لاوازترین پلەی ئیمانە.

بەهرەمەندێتی تاك لە مافی چاودێریی کردنی دەسەڵاتداراانداو ئامۆژگاری کردنیان و ووردکرنەوەی هەڵسوکەوتەکانیان، هەموو ئەمانە پەیوەندییان بە بەهرەمەندێتی و خاوەنێتی تاکەوە هەیە، لە ئازادی ڕا دەربڕیندایە.

بەیانی بنەمای شوراو ئەو شتانەی لەسەر ریزبەندن، لەوانە موناقەشەکانو بوونی مافی پاڵاوتنیش پەیوەستە بە هەبوونی مافی ئازادی رادەربڕینەوە، لەبەرئەوە بەجێهێنانی شورا بەبێ ئازادی بیر نەگونجاوە (نا ممکن).

یەکێك لە کارو ئیشە گاڵتەجاریو شەرمەزارییەکان ئەوەیە کە حکومەت لە کاروبارە چارەنووس سازەکاندا سوود لە شورا وەربگرێت، بەڵام هێرش بکاتە سەر ئازادی رادەربڕینو دای بماڵێت لە تاکەکان.

فەرمانڕەوایانی حکومەتی ئیسلامی ئازادی رادەربڕینیان لە دەروونی تاکەکاندا پەروەردە دەکرد و هەرکاتێك سارد دەبوونەوەو وازیان لێ دەهێنا رەخنەیان لێ دەگیرا، پیاوێك بە عومەری کوڕی خەتتابی وتی: (اتق الله يا عمر) واتە: لەخوابترسە ئەی عومەر، پاشان عومەر (رضي الله عنه) فەرمووی: (ألا فلتقولوها، لا خير فيكم ان لم تقولوها، ولا خير فينا ان لم نسمعها). ئاگادار بن کە ئەو قسەیە بڵێن، چونکە چاکیتان تێدا نییە ئەگەر نەیڵێنو ئێمەیش راستیو چاکیمان تێدان نییە ئەگەر گوێتان لێ نەگرین.

## ئازادی رادەربڕین پابەندە بە ئازایەتیەوە

لە پێناو بەهەرمەند بوون لە ئازادی رادەربڕیندا تەنیا دان بە بوونی ئەم مافەدا بۆ تاك، بەس نییە، بەڵكو پێویستە بە ئەندازەیەكی تەواو خاوەنی ئازایەتییەك و هێزێكی دەروونی بن‌و رێگا بە خۆیان نەدەن بۆ هیچ جۆرە ترسێك لەبەردەم خاوەن دەسەڵاتەكاندا، چونكە ترس‌و دڵ بەزیوی‌و لاوازی، تاك لا دەدات لە ئاشكرا كردنی بیروباوەڕەكەی، كە ئەمەش نیشانەی هەرەسهێنانی ئوممەت‌و پێچەوانەی سەركەوتنی خواییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: (اذا رأيتم امتي تهاب الظالم ان تقول له انك انت ظالم فقد تودع منهم).[١] واتە: هەركاتێك ئوممەتەكەمتان بینی ئەترسان بەستەمكار بڵێن تۆ ستەمكاری، ئەوا وازیان لێ بهێنن.

فاكتەرێك كە مایەی بەهێزكردنی رەوشتی ئازایەتی‌و هێزی دەروونییە لە لای تاكی موسڵمان، جێگیركردنی بیروباوەڕی بێگەردی یەكتاپەرستییە لە قوڵایی دڵ‌و دەروونیداو ئامادەیی واتاو چەمكەكانێتی لە هۆش‌و بیردا.

هەركاتێك موسڵمان بەشێوەیەكی قووڵ‌و ئاگایانە زانی كە سوود و زیان تەنیا لە دەستی خوای گەورەدایەو جگە لە خودی پیرۆزی ئەو، هەموو بەندەیەكن كە نە بۆ خۆیان‌و نە بۆ هیچ كەسێكی تریش توانای هیچ جۆرە زیان‌و سودێكیان نییەو سەرۆكی حكومەت‌و خەڵكانی تریش هەموو دروستكراوی خوان‌و لە بەردەم خوادا بەرپرسیارن لە كاروكردەوەكانیان، هەرگیز ناترسێت لەوەی بیروباوەڕی خۆی ئاشكرا بكات.

وە ئەگەر بەو هۆیەیشەوە دەسەڵاتداران رووبەرووی بوونەوە، رێگا بە خۆی نادات بۆ هیچ جۆرە نیگەرانی‌و ترسێك، چونكە خوای گەورە یارمەتی دەرێتی‌و تەمەن‌و ژیان جگە لەو لە دەستی كەسی تردا نییە.

---

١) مسند امام احمد، ج٢، ص١٦٢.

## سنوورەکانی ئازادی رادەربڕین

ئازادی رادەربڕین بە جۆرێك نییە کە سەربەخۆو رەها بێت لە هەموو جۆرە قەیدو بەندێك، بەڵکو چەند سنوورو مەرجێکی بۆ دانراوە وەك ئەمانە:

**قەیدی یەکەم:** قەیدی گشتییە کە بەکارهێنانی هەموو مافێك لە خۆدەگرێت، کە ئەویش بریتییە لە چاکی مەبەستو پاکێتی نیەت.

واتە ئامانج لە بەکارهێنانی ئەم مافەدا مایەی رەزامەندی خوای گەورە بێتو لەپشت ئازادی رادەربڕینەوە گەیشتن بە راستیو سودگەیاندن بە کۆمەڵگاو خێرخوازیی لە پێناو وئیسلامو سەرکردەکانی موسڵمانانو سەرجەمی موسڵماناندا بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات لەبەرچاو بگیرێت.

**قەیدی دووەم:** ئەم قەیدە لە واتای خاڵی یەکەمەوە سەرچاوە دەگرێو دێتە زیهنەوە، کە ئازادی رادەربڕین لە پێناو خۆهەڵکێشان و فڕوفێڵو نزمکردنەوەی پلەوپایەی خەڵکانی تر و رسواکردنو بەدناو کردنیان و گەورەکردنی کەمو کورتییەکانیان، یان دەستگەیاندن بە سامانو پلەو پایە، بەکارنەهێنرێو نەکەوێتە ناو بواری خراپ بەکارهێنانەوە.

**قەیدی سێهەم:** لەبەرچاوگرتنی بنەماو بیروباوەڕە ئیسلامیەکان، لەبەرئەوە ناڕەوایە کە تاك بە بەهانەی ئازادی رادەربڕینەوە ئیسلامو پێغەمبەرو بیروباوەڕە ئیسلامیەکان بخاتە بواری سەرزەنشتو لۆمە کردنەوە.

ئەم کردەوانە دەبێتە هۆکاری هەڵگەڕانەوەی موسڵمان و شایەن بوونی بە تۆڵە لێکردنەوەو بەڵگەی پێویستی بوونی رادەربڕین نابێتە هۆکاری رزگاربوونی لەو تۆڵەو سزایە.

هیچ کەس ناتوانێت بەهۆی خۆدانە پاڵ ئازادی رادەربڕینەوە پەردەی ئابروو بدڕێو خراپە لەگەڵ خەڵکیدا بکاتو بە ئیشو کاری نابەجێو ناپەسەند تاوانباریان بکات، لەبەرئەوە هەرکاتێك زیانگەیاندنو خراپەکاری بڵاوەی کرد ئازادی رادەربڕین دەوەستێنرێت.

## ئازادى رادەبڕين و زيان گەياندن بە حكومەت

هاوولاَتيان ئەو مافەيان هەيە كە لە كاروبارە حكومەتييەكانو هەڵسوكەوتى دەسەلاَتداراندا، بيروبۆچوونى خۆيان نيشان بدەن، وە هەركاتێك بە ناتەواوىو نادروستى هەڵسوكەوتەكانيان زانى مافى ئەوەيان هەيە نارِزايى بن ليێى، بەلاَم ناتوانن دەستەبەركردنى زيانو خراپەكارى لە كۆمەڵگەدا بۆ خۆيان بە رەوا بزانن‌و پێچەوانەى بيروبۆچوونەكانى خۆيان سەركپ بكەن، بەلاَم هەركات لە لايەن ئەوانەوە خراپەو زيان رووبەڕووى كۆمەلگا نەبووەوە ئەوا حكومەت ناتوانێت لە دژى ئەوانو كاروكردەوەكانيان هەستێت، ئەمەش سنوورى جياكەرەوەى  ئەو بابەتانەيە كە لە بيروبۆچووندا هەندێكيان رەوانو هەندێكيان نارەوان، ئەمە ئەو سنورو ئاستەيە كە پێشەوا عەلى كوڕى ئەبوتاليب ﵁ ئاماژەى پێدەكات، لە كاتێكدا ديدوبۆچوونى (خەواريج) دەربارەى ئەو روونو ئاشكرايە، بەم حالەوە پێشەوا عەلى ﵁ پێى فەرموون: **(ولا نبدؤكم بقتال ما لم تحدثوا فساداً)**.[١] واتە: دەستپێشخەرى ناكەين بۆ شەرِكردن لەگەلّتانا، مادەم خراپەكارى بلاَونەكەنەوە.

بەم پێيە حكومەت لەگەلّ پێچەوانە فيكرييەكانى خۆيدا تا كاتێك كە بە هۆى زۆركردنو هەرِەشەكردنەوە خەلّكى ناچار نەكەن بۆ پەسەندكردنى بۆچوونەكانى خۆيان، رووبەڕوويان نابێتەوەو هێرش ناكاتە سەريان.

ئەبويەعلا لە پەرِواى **(أحكام السلطانية)** دا دەربارەى (خەواريج) دەفەرمويێت: "لە كاتێكدا بيروبۆچوونەكانى خۆيان بلاَودەكردەوە هاتوچۆى دادپەروەرەكانيان دەكرد، پێشەوا عەلى كوڕى ئەبوتاليب نادروستىو ناراستىو داهێنراويى بيروبۆچوونەكانيانى بۆ روون دەكردنەوە، تا بگەڕێنەوە بەرەو باوەڕى راستو بەرەو كۆمەلّ".[٢]

---

١) نيل الأوطار، ج٧، ص١٥٨- ١٥٩.

٢) امتاع الاسماع، ص١٠١.

## حەوتەم: مافی فێربوون

### جێگەی زانست لە ئیسلامدا

ئیسلام جێگەیەکی بەرزی بۆ زانستو زانایان داناوە و مرۆڤ بانگهێشت دەکات بۆ خواستی زیادبوونی ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا﴾ (طه: ١١٤) واتە: بلێ پەروەردگارا زانستو زانیاری زۆرم پێ ببەخشە.

بوونی زانست پێویستییەکە لە پێناوی پەسەندی کردەوەکاندا، چونکە کردەوەی پەسەند کراو ئەوەیە کە بە تەواوی لە پێناو بەرجەستەکردنی ڕەزامەندی خوای گەورەدا ئەنجام بدرێ، هەروەها راستو دروست بێو هاوڕای شەریعەت بێ، کە ئەمەش خودی پابەند بوونە بە شەریعەتەوە.

**زانستەکان دوو بەشن:**

**یەکێکیان:** زانستێکە فێربوونیان (فەرزی عەین)ەو زانینیان لەلایەن تاکەوە پێویستییە، وەك ئەرکەکانی پەرستش، کە پێویستە لەگەڵ زانیندا بێت.

**دووەمیان:** زانستێکە کە زانینان فەرزی (کیفایە)یە بە دەستهێنانیان لەلایەن ئوممەتەوە پێویستە (واجبە)و پەیوەندی بە سەرجەم پێویستییە دینیو دنیاییەکانەوە هەیە وەك: پیشەسازییەکان، پسپۆڕییە جۆراوجۆرەکان، دەستنیشانکردنی لێپرسراوان و فەرمانڕەوایانو هاوشێوەی ئەمانە.

بێگومان ئەو زانستانەی کە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا دەرکەوتوون و پەیدابوونو بابەتی پێویستی ئوممەتن، لە دەستەی (فەرزە کیفایەکانن)و بەدەست هێنیان لە لایەن حکومەتەوە پێویستە (واجبە)، چونکە حکومەت بە نوێنەرو جێگری ئومەت دەژمێردرێت لەم کاروبارانەدا.

داخوازی ئەم ئەركەش ئاسانكردنی ڕێگەكانی فێربوون لە بەردەم هاووڵاتیاندا و كەسانی شایستەیە كە خاوەنی بڕوانامەی زانستیو پسپۆڕیە جۆراوجۆرەكان بن، تا ئەوان ئەو ئەركانەی مایەی پێویستی ئوممەتن بە ئەنجامی بگەیەنن.

ئەمانە هەمووی باس لە ڕێككردنەوەی هاوسەنگی مەجالەكان دەكەن لە نێوان هاووڵاتیاندا لە بواری بەدەست هێنانی زانستو بەجێهێنانی ئەركە پێویستییەكان لە لایەن حكومەتەوە.

لە ڕەوشو سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ پێشینەیەكی گرنگ هەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەركی حكومەتە كە ڕێگاكانی زانستو زانیاری بۆ خەڵك ئاسان بكات.

لە سیرەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە كە: (نرخی ئازادكردنی یەك كەس لە گیراوەكانی جەنگی بەدر چل (اوقیە)[1] بوو، هەركەس توانای ئەوەی نەبوایە دە كەسی لە موسڵمانەكان فێری خوێندنو نووسین دەكرد).

ئەم باسە ئاماژە بەوە دەكات كە فێركردنی تاكەكان لە لایەن حكومەتەوە لە جێگەی ئەركێكدایە.

## هەشتەم: مافی سودوەرگرتنی تاك، لە سەرپەرشتی كردنیدا لەلایەن حكومەتەوە

### مەبەست لەم مافەو بنەماكەی:

مەبەست لەم مافە ئەوەیە كە تاك لە كاتی پێویستی و بێتوانایی دا دەتوانێت بە جۆرێك بە لە ئەستۆگیریو سەرپەرشتی گشتی لە لایە حكومەتەوە ئومێدەوار بێت، لەبەرئەوە ناگونجێت كە تاك لە حكومەتی ئیسلامیدا لەناو بچێت، لە كاتێكدا كە حكومەت چاودێری كاری بێت و ئاستی ژیانی بزانێتو لە بێتواناییو ئازارەكانی بیٚ ئاگا بێت...

بنەمای ئەم مافە ئەوەیە كە كۆمەڵگای ئیسلامی كۆمەڵگایەكی هەرەوەزییەو لەسەر بنەڕەتی هاریكاریی كردن بونیات دەنرێت، بەو شێوەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ﴾ (**المائدة**: ٢) واتە: یارمەتیو هاوكاری

---

١) (اوقیە) یەكەی پێوانەی پارەیە، بەرامبەر حەوت مسقاڵە.

یەكتری بكەن لەسەر چاكەو خواناسی، نەكەن یارمەتیو هاوكاری یەكتر بكەن لەسەر تاوانو ستەمكاری.

لە دیاردەكانی ئەم هاوكاری كردنە ئەوەیە كە كەسی خاوەن سامان یارمەتی كەسی خاوەن پێویستی بداتو پێویستییەكەی بە هۆی زیادەی داراییو ئازوخەو شمەكەوە كە لە توانایدایە، بۆ جێبەجێ بكات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **(من كان معه فضل ظهر فليعد به على من لا ظهر له، ومن كان له فضل زاد فليعد به على من لا زاد له)**.[١] واتە: هەركەسێك هەڵگرێكی زیادەی هەیە (ئەو شتانەی مرۆڤ هەڵدەگرنو دەیگوزانەوە) با بیدات بە كەسێك كە هەڵگری نییە، هەركەسێك توێشوو ئازووخەیەكی زیادەی هەیە با بیدات بە كەسێك نییەتی.

لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: **(من كان عنده طعام اثنين فليذهب بثالث ومن كان عنده طعام اربعة فليذهب بخامس أو سادس)**.[٢] واتە: هەركەسێك خواردنی دوو رۆژی هەبوو با سێیەم بكات بە خێر، هەر كەسێك خواردنی چوار رۆژی هەبوو، با پێنجەمو شەشەم بكات بە خێر.

لێرەدا كاتێك حكومەت نوێنەری كۆمەڵگەیەو جێگرایەتی ئوممەتی لە ئەستۆ گرتووە، بۆیە لێپرسراوێتی ئەنجامدانی چەمكو واتاكانی ئەم فەرموودە پیرۆزانەی لە ئەستۆدایە، لەبەرئەوە سەرپەرشتی كردنی خاوەن پێویستییەكانو هەژاران دەخاتە سەر شان.

لەم زەمینەیەدا فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە كە ئاماژە بە پێویست بوونی ئەم لێپرسراوێتییە دەكات لەسەر حكومەت: **(فاي مؤمن مات وترك مالا فلترثه عصبة من كانوا، ومن ترك دينا او ضياعا فليأتيني فانا مولاه)**. واتە: هەر ئیماندارێك مردو ماڵو سامانێكی بەجێ هێشت، با جێگرەكانی هەڵیگرن بۆ خۆیان، گەر هەركەسێكن، بەڵام ئەگەر قەرزار بوو، یان ژنو منداڵی بەجێهێشت (كە ئەو بژێوی دەكێشان) ئەوا بیان هێنن بۆ لای من، چونكە من سەرپەرشتیاری ئەوانم.

---

١) المحال، ابن حزم، ج٢، ص١٥٦.

١) المحال، ابن حزم، ج٢، ص١٥٧.

شەوكانی لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە دەفەرمویت: "خەتابی، لەبارەی (ضیاع)ەوە دەڵێت: (ضیاع) چاوگە، باسی ئەو كەسانەیە كە مردوو لە دوای خۆی بەجێی هێشتوونو هیچ شتێكیان نەبووە.... ئەوەی كە ئایا پێغەمبەر ﷺ قەرزی ئەم كەسانەی لە (بیت المال) داوەتەوە یان لە ماڵی خۆی، جێگەی جیاوازییە.... لە درێژەی باسەكەیدا دەڵێت: لەمەوە وا روون دەبێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لە (بیت المال) دەدایەوە".[١]

بەم پێیە نزیكە نیازمەندەكانی كەسی قەرزارو ئەو كەسانەی كە هیچ ماڵو سامانێكیان نییە، لە (بیت المال)ەوە بەو ئەندازەی كە پێویستییەكانیان جێبەجێ ببێت یارمەتی دەدرێن، لە فەرموودەیەكی صەحیح دا هاتووە: (**كلكم راع وكلكم مسئول عن رعیته، فالامیر الذي على الناس راع وهو مسئول عنهم**). واتە: هەمووتان شوانن، هەمووتان بەرپرسیارن بەرامبەر بە خێزانەكانتان و ئەو دەسەڵاتدارەی فەرمانڕەوای خەڵكییە، شوانەو بەرپرسیارە لێیان.

پێشەوا نەوەوی لە توێژینەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمویت: زانایان دەڵێن: راعی ئەو پاسەوانە پشت پێ بەستراوەیە كە پابەندە بە چاودێری كردنی چاكەو رێكخستنی ئەو كاروبارانەوە پێی دراوە، یا لە ژێر چاودێری ئەودایە، لەبەرئەوە داخوازی لێ دەكرێت كە لەوبارەوە بە دادپەروەرانە رەفتار بكاتو لە نیازی جێبەجێ كردنی بەرژەوەندییە دینیو دنیایی هاوبەشەكاندا بێت".[٢]

بە بێگومان یەكێك لە بەرژەوەندییەكانی تاك لە ژیانی دونیادا دەستەبەركردنی پێداویستییە زەرورییەكانیانە، لە كاتی ناتواناییدا.

دەستەبەركردنی ئەم پێویستییانە پەرستنی خوای گەورەیان بۆ ئاسانتر دەكات بەو بەڵگەیەی كە مرۆڤی خاوەن پێویستی لە كاتێكدا توانای بەدەستهێنانی پێویستییە سەرەتاییو زەرورییەكانی خۆی نەبێت، ناتوانێت بەشێوەیەكی شایستە خوای گەورە بپەرستێت، چونكە ئەم پێویستیانە سەرنجی ئەم رادەكێشن بە خۆیانەوە.

---

٢) نیل الاوطار، شوكانی، ج٢، ص٥٧.

١) اللؤلؤ والمرجان فیما اتفق علیه الشیخان، ج٢، ص٣٨٤.

**ئەو شتانەی پەیوەندییان بە تاکەوە هەیە لە پێش سوودوەرگرتنی لە مافی سەرپەرشتی کردنی حکومەتدا**

کۆمەڵە دەستوورو یاساو مافێك کە شەریعەت باسیان دەکات بەردەگرن لە مافی سەرپەرشتی کردنی تاك لەلایەن حکومەتەوە، هەرکاتێك سەرجەمی ئەمانە لەبەردەم کێشەو پێویستییەکانی تاکدا چارەساز نەبوون، ئەوا حکومەت لەبەرامبەر ئەوەدا هەڵدەستێت بە ئەرکەکانیو تاك بە هەموو هەنگاوێکی بێ تواناییو بێ هێزییەوە لە بیمەی گشتی سەرپەرشتی خۆیدا بەشداری دەکات، ئەو دەستوورانەش بریتین لە:

**یەکەم: لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە تاک دەتوانێت پێویستیەکانی خۆی جێبەجێ بکات**

بنەڕەت لەسەر ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی ئیشو کارو بەدەستهێنانەوەی پێویستییەکانی خۆی جێبەجێ بکاتو دەست بۆ خەڵکی تر درێژ نەکات، چونکە دەستی ئیشکەر باشترە لە دەستی داواکەرو بەخشین لە گرتنەوە چاکترەو بەخشینیش لەگەڵ بوونی سامان دایەو سامانیش بەبێ رێگەی کارو هەوڵدان بەدی نایەت، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە:

**(والذي نفسي بيده لان ياخذ احدكم حبلة فيذهب به الى الجبل، فيحطب ثم يأتي فيحمله على ظهره فيأكل خير له من ان يسأل الناس)**. واتە: سوێند بەو کەسەی گیانمی لە دەستدایە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە گوریسەکەی هەڵبگرێت روو بکاتە کێوێكو چیلکەو دار کۆبکاتەوەو پاشان بیدات بە کۆڵیداو بیبات بیفرۆشێ لەوە رزقو رۆزی بخوات، باشترە بۆی لەوەی کە داوا لە خەڵکی بکات.

لەبەرئەوە داواکردن لە خەڵکی یان لە نوێنەری خەڵکی کە (حکومەتە) تا کاتێك کە مرۆڤ توانای ئەنجامدانی ئیشو کاری هەبێت، شتێکی نادروستو ناشایستەیە.

**دووەم: پێویستە حکومەت رێگاکانی ئیشو کار بۆ خەڵکی بەدی بهێنێت:**

هەر کاتێك ئەگەر لە دیدگای شەرعەوە ئەنجامی ئیشو کاری داواکردنو دەرۆزەیی قەدەغە بێتو حکومەتی ئیسلامیش لە پێناوی بەجێهێنانو پیادەکردنی ئەوەی کە هۆی رازیبوونی

شەرعەو لەناوبردنی ئەوەی شەرع پەسەندی ناکات دەمەزرابێت، ئاشکرایە کە حکومەتی ئیسلامی هەڵدەستێت بە ئاسانکردنی ڕێگاکانی ئیش‌و کار بۆ تاکەکان.

لە دەستەی ئەرکە حکومەتیەکان لە بەرامبەر هاووڵاتیاندا ئەوەی کە ئیش بۆ تاکە بێکارەکان پەیدا بکات‌و بە هۆی جێبەجی کردنی نەخشەو پرۆگرامە سوودبەخشەکانەوە ئیش‌و کار بۆ تاکەکان بەدی بهێنێت.

وە پێویستە سامانی (بیت المال) بەبێ سوودو قازانج خەرج نەکات، تا ئەگەر هەر کاتێك لە پێناوی پەیداکردنی ئیش‌و کاردا بۆ تاکەکان، پێویستی بوو لە (بیت المال) قەرزیان پێ بدات، چونکە قەرزدان دروست‌و ڕەوایەو لە خێرکردنیش بەرزترە.

زانای بەناوبانگ (ئەبو یوسف)ی قوتابی (ئەبو حەنیفە) لەم بارەوە دەفەرموێت: "هەر کاتێك خاوەنی زەویەکی (خەراج)[1] بە هۆی هەژارییەوە لە کشتوکاڵ کردنەکەی وەستا، ئەوا لە (بیت المال) بە ئەندازەی پێویستییەکەی قەرزی پێ دەدرێت تا بە هۆیەوە دەست بکاتەوە بە ئیش‌و کارەکەیی‌و بەرهەم هێنانەوەی زەوییەکەی".[2]

**سێیەم: مافی بژێوی کێشان (نەفەقە):**

هەر کاتێك ئیش‌و کار دەست نەکەوت، یان هەبوو، بەڵام تاك بێ توانا بوو لە بەردەم ئەنجامدانی دا، ئەوا لەسەر خاوەن سامانە نزیکەکانی پێویستە کە بژێوی بکێشن، وەبەم شێوەیە بەهۆی بەهرەمەندبوونی تاك لەم مافەدا پێویستییەکانی جێبەجی دەبێت.

بوونی ئەم جۆرە بیمەیەیش لە نێوان تاکەکانی خێزان‌و سەرجەمی نزیکەکاندا لەسەر بنەمای کەڵك پێگەیاندن‌و ئارەزووی چاکەکردن بەدی نەهێنراوە، بەڵکو لەسەر بنەمای پێویست بوون‌و پابەندبوون دامەزراوە.

---

١) زەوی (خەراج) بەو زەوییانە دەوترێت کە بە هۆی هێزی موسڵمانانەوە رزگار کراوە، بەڵام لە دەستی ئەو کەسانەدا ماونەتەوە کە زووتر کشتوکاڵیان تێدا کردووە.

٢) ابن عابدين، ج٢، ص٣٦٤.

**چوارەم: زەكات**

هەركات تاك توانای ئەنجامدانی كاری نەبێت، وەیا ئەو شتەی كە بە هۆیەوە دەرامەتی لێوە بەدەست دێنێت، دەستی نەكەوت، لە نێو نزیكەكانیشیا كەسێك نەبێت بژێوی بكێشیَ، ئەوا لە سامانی زەكات، كە مافی خاوەن پێویستییەكانە لە سامانی دەوڵەمەندەكاندا جێبەجێ دەكرێت، لە بنەڕتدا ئەركی كۆكردنەوەی زەكاتو گەیاندنی بە دەستی ئەو كەسانەی كە شیاون، لە ئەستۆی حكومەت دایەو ڕەوا نییە كە بە غەیری كەسە شیاوەكان بدرێن.

ئەركی حكومەتە كە بەرنامەی كۆكردنەوەی زەكاتو هەستانی پێویست ئەنجام بدات لە پێناو گەیاندنی دا بە دەستی هەژارو بێ دەرامەتەكان.

كەواتە زەكات بیمەیەكی گشتی كۆمەڵایەتییە لە پێناو هەژاراندا، حكومەت لە كاتی پێویستدا لە ڕێگەی هێزو دەسەڵاتەوە بەجێی دەهێنێت، وەك چۆن پێشەوا ئەبوبەكر ﷺ لەگەڵ ئەو كەسانەدا جەنگا كە نەفی زەكاتیان دەكرد.

دەرماڵەكردنو وەرگرتنی زەكات گرنگییەكی زۆر گەورەی هەیە، چونكە لە ئەنجامدانیدا هەژارو دەستكورت نامێنێتەوە، چونكە لە سەرمایەو سەرجەمی سوودەكانی و تەواوی لقەكانی دارایی وەردەگیرێ، وەك: پارە، كاڵا، ئاژەڵ، بەرهەمو كانزاكان..

ئەگەر لە وڵاتێكی وەكو عێراقدا زەكات كۆبكرێتەوە ساڵانە دەگاتە ملیۆنەها دینارو بەشی سەرجەمی خاوەن پێویستییەكان دەكات.

**سەرپەرشتی تاكەكان بە هۆی (بیت المال)ەوە لە لایەن حكومەتەوە**

هەر كاتێك ئەو ڕێگاو دەستوور و مافانەی باسكران بەس نەبوون بۆ چارەسەركردنی ئاتاجی خاوەن پێویستیەكان، حكومەت دێتە ناوەوەو پارێزگاری لە تاكەكان دەكاتو لەسەر بنەمای بنچینەیی پێویست بوونی هاوكاریكردن لەگەڵ تاكەكانی كۆمەڵگای ئیسلامیدا، بابەتی جێبەجێ كردنی خۆی بەكاردەهێنێو لە (بيت المال)ەوە بە ئەندازەی پێویستیەكانیان یارمەتییان پێدەدات.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: (بە بۆچوونی من هەر کاتێك زەکات بەس نەبوو بۆ چارەسەرکردنی پێویستییەکانی نیازمەندان، ئەوا لە لایەن کۆمەکە نەقدییەکانی (بیت المال)ەوە سەرجەم یارمەتی دەدرێن).[1]

هەر کاتێك حکومەت سستی بنوێنی بۆ بەجێهێنانی ئەم مافە، کەسی نیازمەند دەتوانێت لە پێناو جێبەجێ کردنی ئەم مافەدا کە لەسەر شانی حکومەتە داوا بەرز بکاتەوە و دادوەریش بۆ جێبەجێ کردنی بڕیار دەربکات.

ئەم بۆچوونە لە لایەن یەکێك لە یاساناسەکانەوە کە ناوی (ابن عابدین)ە پیشان دراوە، بە بۆچوونی ئەو پێویستە دادوەر لە ڕێگەی پابەندی بڕیارەوە (**الزام القضائي**) دەسەڵاتدار (ولي أمر) ناچار بکات بە بژێوی کێشانی هەژاران وەك چۆن کە سەرپەرشتیار یان نزیکەکانی نیازمەندیش کە خاوەنی سەروەتو سامان بن پابەند دەکات بە بژێوی کێشانییەوە.[2]

لە پێشینەی مێژوویدا کۆمەڵە بەڵگەیەك هەن کە پشتگیریی بوونی مافی تاکەکان دەکەن لە بەرامبەر سەرپەرشتی کردنیان لە لایەن حکومەتەوە، بە هۆی (بیت المال)ەوە.

پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ لە بارەی بەهرەمەندی تاکەکان لە (بیت المال)دا ڕێگەیەکی توندو تۆڵی بونیاد ناوە کە دەفەرموێت: (.. **فالرجل وبلاؤه، والرجل وقدمه، والرجل وحاجته**). واتە: پیاوو بەڵاکەی، پیاوو تووشهاتەکەی، پیاوو پێویستییەکەی.

لە قاتوقڕی ساڵی بەناوبانگ بە (عام الرماد)[3] = ساڵی خۆڵەمێش)دا بە شێوەیەك کە وشکەساڵی هەموو جێگەیەکی گرتەوەو باران نەدەباری، ئیمامی عومەر ﵁ خواردنی بۆ هەژاران دروست دەکردو فەرمانی دەکرد بە بانگدەرەکەی کە بانگەواز بکات، هەرکەس دەیەوێت خواردن بخوات ئامادەبێ‌و بۆ خۆی‌و خێزانەکەشی لێی هەڵگرێت.[4]

---

١) السياسة الشرعية، ابن تيمية، ص٥٣.

١) التشريع الاسلامي في خواصه ومراحله، مامۆستا موحەممەد ئەبو زوهرە.

٢) **(عام الرماد)** ساڵێك بوو کە خەڵکی تووشی گرانی و قاتوقڕی بوون، لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا، کە ساڵی (١٨)ی کۆچیی بوو.

٣) الطبقات، ابن سعد، ج٣، ص٣١١.

**بێ توانابوونی حكومەت لە سەرپەرشتی كردنی نیازمەنداندا**

هەركات بە هۆی چۆڵ بوونی (بیت المال) ەوە حكومەت بێ توانا بوو بەرامبەر بە سەرپەرشتی كردنی هەژاران، یان بودجەی كاركردنی ناتەواو، بەس نەبوو بۆ پێویستییەكانی هەژاران، ئەو كاتە ئەركی سەرپەرشتی كردن دەگوێزرێتەوە بۆ سەر ئەو تاكانەی كە توانای سەرمایەو دارایی ئەوەیان هەیە.

ئەم بابەتە یەكێكە لەو (فەرزە كیفایە)یانەی كە ئەركی ئوممەتە جێبەجێی بكات، یاساناسەكان لەم بارەیەوە دەڵێن: (لە دەستەی فەرزە كیفایەكان دوورخستنەوەی زەرەرو زیانە لە موسڵمانان، وەك دابین كردنی جلوبەرگ بۆ كەسانێك كە بێ پۆشاكن، تێركردنی برسییەكان، لە مەرجێكدا كە ئەمانە بە هۆی زەكاتو (بیت المال)ەوە كە لە ئەستۆی سەرمایەداراندایە ـ ئەویش ئەو كەسانەن كە زیاتر لە ئەندازەی ساڵێك خۆیانو تاكەكان دەكەونە ژێر لە ئەستۆگیریانەوە ـ چارەسەر نەكرێت).

بەڵام ئایا قەڵاچۆكردنی زیان ئەوەیە كە لە ئەندازەی تێركردنی سكدا بێت، یا بە ئەندازەیەكی پێویست ناتەواوییەكانی تاك لابەرێت؟

پێ دەچێت ئەوەی دووەم راست تر و تەواوتر بێت، ئەوەی كە پۆشاكە، پێویستە تەواوی لاشە داپۆشێ لەگەڵ رەچاوكردنی هاوینو زستانیشدا.

بەم پێیە لە دوای خۆراكو جلوبەرگ ئەو شتانەش لە خۆدەگرێت كە پەیوەندییەكی راستەوخۆیان لەگەڵ تاكدا هەیە، وەك پارەی دەرمانو چاودێریی پزیشكیو كرێی پزیشكو ... هتد، كە ئەمانە خۆیان روونن.[١]

كەواتە لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا پێویستە سەرمایەداران لە كاتی بێ توانایی (بیت المال)دا یارمەتی هەژاران بدەن بەشێوەیەكی تەواو.

لە كاتێكدا ئەگەر سەرمایەداران خۆیان لەو كارە پاراستو دووركەوتنەوە ئەوا حكومەت ناچاریان دەكات بە ئەنجام دانی، پێشەوا ئیبن حەزم لەم بارەیەوە دەفەرموێت: "لەسەر

١) المنهاج، نووي، وشرحه رملي، ج٧، ص١٩٤.

سەرمایەدارانی تەواوی شارەکان پێویستە کە هەژاران دڵنیا بکەن، ئەگەر زەکاتیان نەدرێتێ، وە لە سەرجەمی سامانی موسڵمانان یارمەتی نەدرێن، ئەوا حاکم ناچاریان دەکات بە جێبەجێ کردنی ئەو هاوکارییەو بڕیاریان لەسەر دادەنێن لەوەی کە دەیخۆن، لەو دانەوێڵەی کە پێویستیان نییە جلو بەرگی زستانەو هاوینە، هەروەها جێگەو ستارگایەکیش کە لە بارانو سەرماو گەرماو چاوی ڕێبواران بیان پارێزێت". [١]

### سەرپەرشتی کردنی غەیرە موسڵمان لە لایەن حکومەتەوە

سەرپەرشتی کردنی هەژاران لە لایەن حکومەتەوە تەنها سنووری موسڵمانان ناگرێتەوە، بەڵکو غەیرە موسڵمانیش لەخۆدەگرێت، هەروەها زیمیەکانیش لە کاتی هەژاریو نەداریدا شیاوو لایەقی هاوکاریو کۆمەك پێکردنن.

پێشینەی مێژوویی لە بەرامبەر سەرپەرشتی کردنی زیمیەکاندا خاوەنی چەندەها بەڵگەیە، یەکێك لەوانە نامەکانی خالیدی کوڕی وەلیدە کە بۆ دانیشتوانی (حیرە)ی نووسیوە، کە تیایدا هاتووە: (لە پێناو زیمیەکاندا ئەم بڕیارانەم دەرکرد، هەر پیرەمێردێك کە توانی ئەنجامدانی ئیشو کاری نییە، یا دووچاری زەرەرو بەڵا هاتووە، یان سەرمایەدار بووە و ئێستە دووچاری هەژاری بووە و لە بارێکدایە کە هاوئاینەکانی خێری پێ دەکەن، ئەوا چاوپۆشی لێ دەکرێت لە (جزیە)دانو خەرجی و پێداویستییەکانی لە ڕێگەی (بیت المال)ەوە بۆ مسۆگەر دەکرێت، وەك بەو جۆرەی کە لە مەککەو مەدینە پیادە دەکرێت). [٢]

هیچ بەرپەرچیو دژایەتی کردنێکی ئەم نامانە نە لە لایەن خەلیفەی ئیسلامەوە (ئەبوبەکر) ﵁ و غەیری ئەو و موسڵمانانەوە نەگێڕراوەتەوە، لەبەرئەوە دەچێتە بواری کۆدەنگییەوە (اجماع) و سەقامگیر دەبێت.

---

٢) المحلی، ابن حزم، ج٦، ص١٥٦.

١) الخراج، ابویوسف، ص١٤٤.

هەروەها دەبینین خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رەحمەتی خوای لیّ بیّت) دەنووسیّ بۆ (عدی کوڕی ارطاة) کە والی خۆی بوو لە بەسرە (**أما بعد.. وانظر من قبلك من أهل ذمة قد كبر سنه، وضعفت قوته، وولت عنه المكاسب فأجر عليه من بيت المال المسلمين ما يصلحه..**).[1] واتە: لە پاشدا، سەیری حاڵو گوزەرانی ئەو زمیانە بکە کە لە قەڵەمڕەوی تۆدان و پیرو پەککەوتەو لاوازو بیّ هیّز و توانای ئیشو کاریان نەماوە، لە (بیت المال)ی موسڵمانان بە گوێرەی پێویست موچەیان بدەرێ.

## بەشی سێیەم

## مافەکانی حکومەت لە بەرامبەر تاکەکدا

**سەرەتا:**

لە پێشودا ئاماژەمان بەوە کرد کە تاکەکان خاوەنی کۆمەڵێك مافی زۆرن لە بەرامبەر حکومەتدا، کە حکومەتیش بیّ هاوکاری تاکەکان توانای بەرجەستەکردنو ئەنجامدانیانی نییە.

تاکەکان پێویستە لە رووی بەردەوامیو بەهێزبوونی حکومەتدا کار بکەنو ئەو مافانەی کە حکومەت خاوەنێتی لەبەرامبەریاندا بەئەنجامی بگەیەنن.

حکومەت لە راستیدا ماڵی ئەو کەسانەیە کە تیایدا دەژین و پارێزگاری لە داخوازیەکانیان دەکاتو سەرچاوەی خزمەتو سوودپێگەیاندنیانە.

لە راستیدا حکومەت وەك باوکێکی دڵسۆز وایە بۆ منداڵە تاقانەکەی، لەبەرئوە لە سوودو قازانجی تاکە، کە مافەکانی بپارێزێتو پەسەندی بکاتو لە پێناو وەفاکردن بە سەرجەمی مافەکانەوە هێزو تواناکانی بخاتە کارو لە لێپرسراوێتییەکی وەها گەورەدا هاوکاری بکات.

هەرچەندە تاکەکان دەتوانن سەرپێچی ئەو مافانەی حکومەت بکەن کە لەسەریانە، بەلاّم بەرئەنجامی ئەم بیّ فەرمانییە جگە لە زەرەرو زیان و دووچاربوون بە ئاستەنگی و تەنگژە شتێکی تر نابێت.

---

٢) الاموال، ابي عبيد، ص٤٥ ـ ٤٦.

لە گرنگترین مافەکانی حکومەت لە بەرامبەر تاکەکاندا مافی فەرمانبەرداری و مافی بەرگری لێکردن لەم بەشەدا لەم دوو بابەتە دەکۆڵینەوە:

**یەکەم: مافی فەرمانبەرداری (إطاعة):**

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ (**النساء: ٥٩**).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکانتان بکەن.

وەك توێژەرەوانی قورئان دەفەرموون: (اولی الامر) بریتین لە سەرپەرشتیاران یان زانایان.[١]

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە: (**السمع والطاعة على المرء المسلم فيما احب وكره مالم يؤمر بمعصية..**).[٢] واتە: گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری لەسەر کەسی موسڵمان پێویستە، لە خۆشیو ناخۆشیدا پێی خۆش بێت یان ناخۆش، مادەم فەرمان بە سەرپێچیی نەدرێت.

پەیڕەوی کردن لە حکومەت کە لە فەرمانی حکومڕاناندا خۆی دەبینێتەوە، مافێکی شەرعییە لە لایەن حکومەتەوەو لە سەر تاکەکان پێویستە کە فەرمانەکانی و لەوانە ئەو مەرجو دەستوورانەی کە لە پێناو جێبەجێکردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانداو ئەو ئامانجانەی کە لە پێناو پایەداریو دامەزراوی ئەودا دایاندەنێت، بەجێی بهێنن.

پەیڕەوی کردن لە حکومەت لەلایەن تاکەکانەوە، پێویستە فەرمانبەرداریی کردنێکی خۆویستانە (اختیاری) بێت کە لە دڵو دەروونیانەوە سەرچاوە بگرێت، نەك بە جۆرێك کە حکومەت بە زۆر ناچاریان بکات.

سستی نواندن لە بەردەم پەیڕەوی کردن لە حکومەت ئەنجامێکی ناهەمواری لەبەردەمدا دەبێت، لە رووی کەم بوونەوەو سووکبوونی پلە و پایەو تواناکانی حکومەت و پەیوەندی کردنو وابەستە بوون بە بێگانەوە لەلایەن حکومەتەوە، لەپێناو بەدیهێنانی پەیڕەوکردنی تاکەکاندا.

---

١) احكام القرآن، جصاص، ج٢، ص٢١٠، تفسير ابن كثير، تفسير القرطبي.

٢) شرح صحيح البخاري، ابن حجر العسقلاني، ج٣، ص١٠٠.

لەبەرئەوە ئەوە تواناو هێزی خۆی لە كاروبارێكدا بەكاردەهێنێت كە سوودو قازانج و رازی بوونی تێدا نەبێت، سەرەڕای ئەمەش رقو كینەو دوژمنایەتی لە نێوان تاكەكان و حكومەتدا بلاّودەبێتەوەو هەموو باوەڕو متمانەیەك لەبەین دەچێت، هەركات حكومەت بۆ پەیڕەوی كردن لە خۆی، تاكەكان ناچار بكات، ئەمە دەبێتە هۆكاری هەستان و بەرگریی و دژایەتی كردنی تاكەكان لە بەرامبەر حكومەتدا، لەم بوارەشدا فەرمانڕەوا و دەسەلاّتدارە حكومییەكان دووچاری رەگەزەكانی رقو تۆلّە دەبنەوە لە لایەن تاكەكانەوە، ئەو كاتەش حكومەت، ئەو دەولّەتە ئیسلامییەی كە تاكەكان لە پێناو بەجێهێنانی ویستەكانی ئیسلامدا هاوكارییان كردووە دەگۆڕێت بە حكومەتێكی پۆلیسی كە لەسەر بنەمای هێزو ترسو تۆلّە كار دەكات، ئەمەش لە كۆتاییدا بە لاواز بوونی حكومەت دەشكێتەوەو زەرەرو زیانەكەشی رووبەڕووی تاكەكان دەبێتەوە.

## فەرمانبەرداری كردن لە حكومەت لە خۆشیو ناخۆشییدا

بە بەلّگەی بایەخو گرنگیتی فەرمانبەرداریی‌و ئەو رۆلّە تایبەتییەی كە لە دامەزراوی حكومەتدا هەیەتی، ئیسلام فەرمان بەتاك دەكات كە پەیڕەوی و گوێڕایەلّی حكومەت بكات لەوەدا كە پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە.

وەك لە پێشتردا ئەو فەرموودە پیرۆزەمان روونكردەوە (**على المرء المسلم السمع والطاعة فيما احب وكره الا ان يؤمر بمعصية**).

ناگونجێ بۆ حكومەت كە سەرجەمی تاكەكان رازی بكات، لە هەموو كاتو بارێكیشدا كۆمەلّێك لە خەلّكی نارازی، بوونیان هەیە كە ئیشو كارەكانی حكومەتیان بەلاوە ناپەسەندە.

لەبەرئەوە نابێت بنەمای پەیڕەویی كردن لە حكومەت هەواو ئارەزوو بێتو هەرچییەك كە تاك پێی خۆش بوو بە چالاكانە پەیڕەوی لێ بكاتو هەرچییەكیشی بەلاوە پەسەند نەبوو پەیڕەوی لێ نەكات.

گوێڕایەڵی‌و پەیڕەوی کردنی لەم جۆرە (دڵویستییە) لەلایەن تاکەکانەوە، کەم‌و کورت‌و ناتەواوە لە بەرامبەر بەجێ هێنانی واجبێتی گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری کردنیداو هیچ گرنگییەك لە بابەتەکەدا نامێنێ و هەموو کەسێك لەم بوارەدا توانای ئەنجامدانی پەیڕەوی‌و گوێڕایەڵی هەیە.

حکومەتێکی لەو شێوەیە کە لەسەر بنەمای هەواو ئارەزوو بنیات بنرێت دامەزراوی‌و پایەداری‌و بەردەوامی خۆی زوو لەدەست دەدات.

ئەگەر تاك پەیڕەوی لەو شتە نەکات کە خۆی پێی پەسەند نییە بەرەو سەرکەشی و بێ فەرمانێتییەکی ئاشکرا دەڕوات، لەم کاتەشدا حکومەت دەبێ یان بێ دەنگ بێت، کە لە ئەنجامی ئەوەشدا بێ فەرمانی بڵاوە دەکات‌و نائارامیی‌و ئاژاوەو پەشێوی هەموو لایەك لەبەر دەدات‌و پلەوپایەی حکومەت لەناو دەچێت، هەروەها یا هێزی خۆی بخاتە کار لە پێناو بەگوێڕایەڵییکردنی سەرپێچیی کاراندا، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دووبەرەکی و جیابوونەوەو لەبەین چوونی یەکێتیی‌و هەڵگەڕانەوەی شمشێرەکانی حکومەت بە رووی کوشتاری وەچەکانی خۆیدا، کە ئەنجامی ئەمانەش روون‌و ئاشکرایە، ئەمانە بەرەو ئەنجامی سەرکەشی‌و بێ فەرمانییە، کەواتە پێویستە تاك دەروونی خۆی ئاراستە بکات بۆ فەرمان بەرداریی کردنی حکومەت، ئەوەش بە شێوەی پەیڕەوی کردنێکی خۆویستانە کە لە قوڵایی دڵ‌و دەروونییەوە سەرچاوە دەگرێت.

هەروەها پێویستە بزانێت کە پەیڕەوی کردن لە حکومەت پەیڕەوی کردنە لە خوای گەورە، چونکە ئە وفەرمانی بەوە کردووە (مادەم فەرمانەکە لە چاکەدا بێت‌و لە مەوداو باسی لێوە دەکەین).

لەسەر ئەم بنەمایە، وەك چۆن نوێژخوێنان لە نوێژدا پەیڕەوی پێشەواکەیان دەکەن‌و لە پێناو بەجێهێنانی نوێژی بە کۆمەڵدا، کاروکردەوەکانی ئەو دەکەنەوە، تاکەکانیش بەهەمان شێوە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی حکومەت.

## پەيڕەوى كردنى حەرام

گوێڕايەڵى‌و پەيڕەوى كردن لە حكومەت بە جۆرێكى ڕەها نييە، بەڵكو بەو مەرجەيە كە سەرپێچى‌و تاوان نەبێت، ئەگەر لە سەرپێچى دا بوو ئەوا حەرامە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**الا أن يؤمر بمعصية فاذا امر بمعصية فلا سمع ولا طاعة**). واتە: مەگەر فەرمان بە سەرپێچييەك درابێت، ئەگەر فەرمان بە سەرپێچى درا ئەوا نە گوێڕايەڵى هەيە و نە فەرمانبەردارى. ئەمەش هەمان شتە كە توێژەرەوانى قورئان لە تەفسيرى ئەم ئايەتەدا ڕوونيان كردۆتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ (**النساء: ٥٩**). واتە: ئەى ئەوانەى باوەڕتان هێناوە فەرمانبەردارو گوێڕايەڵى خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواكانتان بن.

ئيبن **كثير** لە تەفسيرى ئەم ئايەتەدا دەفەرموێت: "واتە ئەو شتەى كە تيايدا فەرمان بە ئێوە دەكەن پەيڕەوى كردن بێت لە خوا، نەك سەرپێچى كردن بێت لە خوا، چونكە هيچ پەيڕەوى كردنێك لە خەڵكى كە لە سەرپێچى خوادا بێت دروست نييە".

خواى گەورە لە بارەى پەيمانداني ژنان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (**الممتحنة: ١٢**).

واتە: ئەى پێغەمبەر، كاتێك ئافرەتانى باوەڕدار هاتن بۆ لاتو پەيمانيان پێ دايت كە هيچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خوا بڕيار نەدەن، دزى نەكەن، زيان نەكەن، ڕۆڵەكانى خۆيان نەكوژن، هيچ جۆرە بوختانێك نەكەن لە نێوان دەستو پێى خۆياندا (واتە هيچ جۆرە خيانەتێك نەكەن)، بێ فەرمانيت نەكەن لە كارى خێرو چاكەدا، جا ئەوە تۆ پەيمانيان لەگەڵ ببەستەو لە خوا داواى لێخۆشبوونيان بۆ بكە، چونكە بە ڕاستى خوا لێخۆشبوو و ميهرەبانە).

لەم ڕستەيەدا (ولا يعصينك فى معروف) لەبەرئەوەى پێغەمبەر ﷺ جگە لە چاكە فەرمان نادات، بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كە پەيڕەوى و گوێڕايەڵى كردن لە سەرپێچييدا دروست نييە.

## ئەنجامەكانی پەیڕەوی كردنی حەرام

ئەگەر تاك لەو فەرمانانەی حكومەتدا كە پێچەوانەی شەرعی خوایەو لە سەرپێچییەكی ئاشكرادایە كە شایانی هیچ تەفسیرو بەهانەیەك نییە، پەیڕەوی لە حكومەت بكات لە بەرامبەریدا بەرپرسیارەو شایستەی تۆڵە لێ سەندنەوە بێت.

لە فەرموودەیەكی پیرۆزدا لە لایەن پێغەمبەروە ﷺ ئەم بابەتە روونكراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ سریەیەكی نارد و پیاوێكی لە ئەنصار كرد بە ئەمیریان و فەرمانی پێ كردن كە گوێڕایەڵی‌و پەیڕەوی لێ بكەن، لەسەر بابەتێك ئەمیرەكەیان توورە كردو ئەویش فەرمانی پێكردن كە چیلكەو دار كۆبكەنەوەو ئاگری پێوە بنێن، لە پاشدا فەرمانیشی پێ كردن كە بچنە ناو ئاگرەكەوە، بەڵام ئەوان سەرپێچییان كردو نەچوونە ناوی.

كاتێك بابەتەكەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: **"لو دخلوها ما خرجوا منها ابداً انما الطاعة في المعروف".**[1] واتە: ئەگەر بچوونایەتە ناوی بە هەمیشەیی نەدەهاتنە دەرەوە تیایدا (واتە دەچوونە دۆزەخەوە) بەراستی گوێڕایەڵی‌و پەیڕەوی كردن لە كارو فەرمانی چاكەدایە.

هەركات خەڵكی پەیڕەوی لە فەرمانڕەوا خراپەكارەكان بكەن‌و لە بەرامبەر فەرمانە ناڕەواو رەوشە پێچەوانەكانی ئیسلامدا خۆیان بەدەستەوە بدەن، ئەوا شایەنی سزا دەبن‌و هیچ بەهانەو بەڵگەو خۆبەری كردن‌و وەڕس بوونێك سوودیان پێ ناگەیەنێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴿٦٧﴾ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾﴾ (**الاحزاب**: ٦٧-٦٨). واتە: دەڵێن پەروەردگارا بە راستی ئێمە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداری گەورەكانمان بووین، هەر ئەوان رێگەی راستیان لێ شێواندین‌و سەرگەردانیان كردین، پەروەردگارا دوو بەرابەر سزای ئەوان بدەو نەفرینێكی گەورەو زۆر بێ ئەندازەیان لێ بكە.

---

[1] صحيح البخاري، ج٩، ص١١٣ـ ١١٤.

هەروەها دەفەرمویّت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾﴾ (**البقرة**: ١٦٦-١٦٧) واتە: ئەو كات ئەوانەی خەڵكی شوێنیان كەوتبوون لە شوێنكەوتەكانیان خۆیان بەری دەكەن، لە كاتێكدا ئەو سزا توندوتیژە دەبینن هەموو پەیوەندییەكیان دەپچڕێت كە لە نێوانیاندا هەبوو، ئەوانەی كە شوێنكەوتە بوون دەڵێن: خۆزگە گەڕانەوەمان بۆ دونیا بۆ هەبوایە ئەوا ئێمەش ئاوا خۆمان بەری دەكرد لەوان، وەك چۆن خۆیان بەری كرد لە ئێمە، ئا بەو شێوەیە خوا ئەنجامی كارو كردەوەكانیان نیشان دەداتو بۆیان دەكاتە ئاخو حەسرەت، بەراستی ئەوان هەرگیز لە دۆزەخ دەرچوونیان نییە).

لەگەڵ بوونی تێگەیشتنو ئاوەزو زانینێكی وەهادا لە بەرامبەر سنوورەكانی گوێڕایەڵیو پەیڕەویی كردندا، ناگونجێت كە ئوممەتی ئیسلامی تەسلیمی فەرمانی ئەو دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوا ستەمكارو لادراوانە بێت كە پێچەوانەی كۆمەڵێك فەرمان بێت كە ئیسلام بەو جۆرەی دانابێت، چونكە بە هۆی تەسلیم بوونیان لە حەرام دا بەرپرسیار دەبن لە بەرامبەر خوای گەورەدا.

**دووەم: بەرگری كردن لە حكومەتی ئیسلامی (دار الاسلام):**

ئەركی بەرگری كردن لە دەوڵەتی ئیسلامی (دار الاسلام) لە ئەستۆی تاكەكاندایە، كە ئەم بەرگری كردنە بە تێكۆشان لە ڕێگەی خوادا دەژمێررێت.

قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەڵگری چەندەها دەقی فراوانن كە هانی خەڵكی دەدەن بۆ جیهادكردنو فەرزبوونیو گەورەییو پاداشتەكەیو سزای ئەو كەسەی وازی لێ دێنێت، روون دەكەنەوە، لەوانە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ﴾ (**التوبة**: ٤١) واتە: (ئەی باوەڕداران) ئێوە بە چەكی سووكو سەنگینو سەوارەو پیادەتانەوە راپەڕنو ئامادە بنو جیهاد بكەن بە ماڵو سامانو گیانتانەوە لە پێناوی خوادا).

لە فەرمووودەیەکی پیرۆزدا لە ئەبوزەڕەوە گێڕاوەتەوە دەفەرموێت: **(قلت یا رسول الله اي العمل أفضل؟ قال: الایمان بالله والجهاد في سبیله).**[1] واتە: وتم ئەی پێغەمبەری خوا چ کردەوەیەك چاکترە؟ فەرمووی: باوەڕبون بە خواو جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی ئەودا.

ئەرکی حکومەتە کە فەریزەی جیهاد ڕێك بخاتو ڕێگای پێویست و گونجاوی لەگەڵ چەرخی تازەدا بۆ بخاتە گەڕو هۆکارەکانی بەجێهێنانی ئەم فەرزە گرنگەیە بە چاکترین شێوە ئامادە بکات، هەروەها پێویستە ئەو شتانەیش کە پێویستی جیهادن لە نموونەی چەكو تواناو فێرکردنی ئوممەت لە چۆنێتی جیهادکردندا بەدی بهێنێت.

جیهاد تایبەتە بە دانیشتوانی موسڵمانەوەو لەسەر غەیرە موسڵمانەکان پێویست نییە، هەرچەندە ئەوانیش دەتوانن بەشێوەیەکی خۆویستییانە شان بە شانی موسڵمانەکان لەپێناو بەرگریو پارێزگاری کردن لە دەوڵەتی ئیسلامی، لە جەنگدا بەشداری بکەن.

بەو بەڵگەیە (جزیە دان) لەسەر هاووڵاتیانی غەیرە موسڵمان فەرز کراوە، کە بووراون لە بەرگری کردن لە دەوڵەتی ئیسلامی، هەرکات بەشداریان کرد لەم فەرزەدا (جیهاد) ئەوا لەسەر حکومەت پێویستە جزیەیان لێوەرنەگرێت.

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین**

**٧/ذوالحجة/ ١٤٢٣**

**تم بحمدالله**

---

١) ریاض الصالحین، ص٤٦٩.

## سەرچاوەکانی وەرگێڕان

١ـ تەفسیری ئاسان، مامۆستا بورهان موحەممەد ئەمین، چاپی چوارەم، ٢٠٠٢.

٢ـ فرهنگ فارسی عمید (فارسی ـ فارسی) حسن عمید، مؤسسة انتشارات أمیر کبیر، تهران، ١٣٦٩.

٣ـ واژه نامه، فارسی، کردی، دکتر محمد تقی ابراهیم پور، انتشارات ققنوس، تهران، ١٣٧٣.

ژمارەی سپاردن (١٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٣ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

## بلاوكراوەكانى پرۆژەى ( تيشك )

| ژ | ناوى كتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئيسلامكردنى كورد، ماستەرنامە يان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغى |
| ٢ | نەزانيى و بێشەرميى، بەشێك لە چەواشەكارييەكانى مەريوان هەڵەبجەيى لە كتێبى (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتينامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ى زەردەشتى | ن: ئامينە صديق |
| ٤ | فەتواكەى مەلاى خەتێ، ئەفسانەى مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەريم |
| ٥ | صەلاحەددينى ئەييوبى، گەورەتر لە رەخنەگرانى، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفيسۆر دكتۆر موحسين موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلى سەعيد |
| ٦ | بەرەو بەختيارى ئافرەت (بەرگى يەكەم) | جەمال حەبيبوڵلا (بێدار) |
| ٧ | ئازاديى رادەربڕين لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدييەوە بۆ رۆجيە گارودى | ن: د. شەريف عەبدولعەزيم<br>و: وەرزێر حەمەسەليم |
| ٨ | بەجيهانيكردن، ديدێكى ئيسلاميى | ن: د. موحسين عەبدولحەميد<br>و: حەمەكەريم عەبدوڵلا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتى ئيسلاميدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەريم |
| ١٠ | بەرەو بەختياريى ئافرەت (بەرگى دووەم) | ن: جەمال حەبيبوڵلا (بێدار) |
| ١١ | مێژووى دێرينى كوردستان (كتێبى سێيەم) | ن: فازل قەرەداغى |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دكتۆر صەباح بەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەیووبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێكهاتنی، ڕێكخستنی، چەكەكانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەكەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەكی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا<br>و: شوان هەورامی |

| | | |
|---|---|---|
| | (صلی الله علیه وسلم) | |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەلامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوللا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورە و بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەلاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەلات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوریاندا | ن: لیوبو لدڤایس |

| | | |
|---|---|---|
| | | و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٦ | فری فرِی قەل فری | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە) قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو رێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەلایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێری |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵلا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفى محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەلامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣ | بیری ئوسووڵیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | دەروازەیەك لەمەڕ كێشەی ڕۆچوون هۆكار.. كاریگەرێتی .. چارەسەر | ئامادەكردنی : یاسین ئەحمەد زەنگەنە |
| ٥٥ | ئاین لە فیكری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |
| ٥٦ | ئیسلام لە نێوان نەزانی عالمەكانی و بێ توانایی نەوەكانی | نووسینی: جەمال حەبیبوڵا |
| ٥٧ | تاك و حكومەت لە شەریعەتی ئیسلامدا | نووسینی: دكتور عبدالكریم زیدان وەرگێڕانی لە فارسییەوە: هێمن ڕێنوار |